له بڵاو كراوەكانی ماڵپەڕی بەهەشت

# ٦٠٠

# فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بۆ منداڵان

# یان

# بەرنامەی منداڵی موسڵمان بۆ

# لەبەر كردنی فەرموودەكانی پێغەمبەر ﷺ


كۆكردنەوەو ڕێكخستنی

أبي محمد عبدالله محمد بن سعيد رسلان

وەرگێڕانی

صلاح الدين عبدالكريم


---


ماڵپەری بەهەشت

ba8.org

ماڵپەڕێكی ئیسلامی زانستی پەروەردەیی یە و لەپێناو بڵاوكردنەوەی ئەو ئیسلامەیە كە سەلەفی صاڵح - پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی (رضي الله عنهم) لەسەری بوون - وە سەر بە هیچ گروپ و لایەنێكی حیزبی نیە.

## ماڵپەری بەهەشت

**ئەو کتێب و بابەت و لێکۆڵینەوە شەرعیانە بڵاو دەکاتەوە کە دەبنە هۆی:**

١. شارەزاکردنی موسوڵمانان و پەروەردەکردنیان لەسەر ڕێگا ڕاستەکەی ئیسلام، ئەمەش دەستەبەر دەبێ بە گەڕانەوە بۆ پەیڕەوە ڕەسەنەکەی ئیسلام،کە بریتی یە لە قورئان و سوننەت،بە تێگەشتنی پێشین وپێشەوایانی ئوممەت.

٢. پاک کردنەوەی بیروباوەڕ و ڕەوشتی موسوڵمانان، لە دیاردەکانی شیرک و کوفر و تاوان.

٣. پاڵاوتن و تەصفیەکردنی ئاینی ئیسلام لە بیدعە و بۆچونە داهێنراوەکان.

٤. وریا کردنەوەی موسوڵمانان لە شوێنەواری خراپی ڕیوایەتە لاواز و هەڵبەستراوەکان.

٥. پتەو کردنی برایەتی یەکی ڕاستەقینە لەسەر بناغە فراوانە جێگیرەکەی ئیسلام و نەهێشتن و کەمکردنەوەی دەمارگیری مەزهەبی و حیزبی.

**ئامانجمان:**

ئاشناکردنی کۆمەڵگایە لە ئیسلامی ڕەسەن و دروستکردنی تاك و کۆیەتی بۆ تێگەشتن لە سەرچاوەکانی کە بریتین لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی صەحیح و ئاشکراکردنی ئەو شتانەی کە نامۆن بە ئیسلام و خراونەتە نێویەوە بە چەندین دەستەواژەی دەنگ و ڕەنگ و نوسراوی لە بوارەکانی بیروباوەڕ و ڕەوشت و ئاکار و پەروەردە و زانست و پزیشکی و گەشەی کۆمەڵایەتی.

**خودایە داوات لێ دەکەین دامەزراومان بکەیت ، وتەوفیقمان بدەیت بۆ هەر کار وگوفتارێکی جوان وچاك بەو شێوەیەیی کەخۆت لێی ڕازیت.**

**ستافی ماڵپەڕی بەهەشت**

بسم الله الرحمن الرحيم

إِنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ بِاللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ .

وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدَاً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ .

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ۝١٠٢﴾

﴿آل عمران﴾.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ۝١﴾

﴿النساء﴾.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ۝٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ۝٧١﴾ ﴿الأحزاب﴾ .

أَمَّا بَعْدُ ...

فَإِنَّ أَصْدَقَ الْحَدِيْثِ كِتَابُ اللهِ، وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ) وَشَرَّ الأُمُوْرِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ .

## پێشەکی وەرگێڕ:

گرنگـــیو بایـــەخ دان بـــە فـــەرموودەکانی پێغەمبـــەر ﷺ ئـــەرکی ســـەرجەم موسڵمانانە هەرکەس بـە گـوێرەی توانـای خـۆی، چـونکە سـوننەتی پێغەمبـەر ﷺ روونکەرەوەی قورئانی پیرۆزەو رووناك کەرەوەی رێگای ژیانە، وە ئەو فەرموودانە هەروا بە ئاسانی بە ئێمە نەگەیشتووە، بەڵکو زانایان لە هـاوەڵانو دوای ئـەوانیش ژیانی خۆیان بەخشیوە تا ئەو فەرموودانەیان بۆ ئێمـە کۆکردۆتـەوەو صـەحیحیان لە لاوازو هەڵبەستراو جیا کردۆتەوە، هاوەڵی وا هەبووە کە زانیبێتی فەرموودەیەك هەیە لە لای کەسـێكو ئـەم نەیبیسـتووە ئـەوا بـۆی دەڕۆیو چـەندەها شـارو دێو وڵاتی دەبڕی تا دەگەیشتە ئەو کەسەو فەرموودەکـەی لێ وەردەگـرت، بـۆ نمونـە عەمری کوڕی عاص (خوای لێ رازی بێت) دوو مانگ رێ دەبڕێـت تـا لـە مەدینـەوە دەگاتە میسر بۆ وەرگرتنی تـەنها فەرموودەیـەك کـە ئـەو نەیبیسـتووە، هـەروەها جابری کوڕی عەبدولا (خوایان لێ رازی بێت) دوو مانگ رێ دەبڕێت لە مەدینەوە بۆ شام تا یـەك فـەرموودە وەردەگرێـت لـە کەسـێك کـە ئـەم نەیبیسـتووە، هـەروەها زانایانی تـر لـە فەرموودەناسـان وڵاتـی خۆیـان جـێ هێشـتووە بـۆ کۆکردنـەوەی فـەرموودەکانی پێغەمبـەر ﷺ وەکـو ئیمـامی بوخـاریو موسـلیمو جگـە لـەوان (رەحمەتی خوایان لێ بێـت) ژیـانی خۆیـان لـەو پێنـاوەدا بەسـەر بـردووەو هێشـتا پێیان کەم بووە، بەم شێوازە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئێمە کۆکراوەتـەوەو

گەیشتووە بە ئێمەو ئێستا لەبەر دەستی ئێمەدایە، بەڵام ئەوەی جێی داخە ئەوەیە کە ئێستا وەکو پێویست گرنگیو بایەخ بە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ نادرێت هەرچەندە هەموویشی لەبەردەستماندایەو گەڕانی ناوێت لەم شار بۆ ئەو شارو لەم وڵات بۆ ئەو وڵات، ئەم فەرموودانەی بەردەستت زیاتر لە (٦٠٠) فەرموودەی صەحیحە کە لە (صحيح الجامع الصغير) ی زانای فەرموودەناس شێخ (محمد ناصرالدين الألباني) وەرگیراوە، وە بە گوێرەی تەمەن دابەش کرابوو لە تەمەنی سێ ساڵییەوە دانرا بوو بۆ لەبەر کردن، بەڵام وا هەستم کرد کە بۆ نەتەوەی کورد گرانە منداڵان بتوانن لەو تەمەنەدا فەرموودە لەبەر بکەن بۆیە من تەمەنەکانم گۆڕی بۆ قۆناغ، لەجیاتی تەمەنی سێ ساڵی کردم بە قۆناغی یەکەم، وەلە جیاتی تەمەنی چوار ساڵی کردم بە قۆناغی دووەمو بەو شێوازە بۆ ئەوەی بە گوێرەی ئاستی لەبەر کردن بێت نەك بە گوێرەی تەمەن، وە مامۆستایانی مزگەوتەکان یان مامۆستایانی خوێندنگە ئایینیەکان یان مامۆستایانی حوجرەکان یان دایكو باوکان لە ماڵەوە دەتوانن بە گوێرەی قۆناغەکان بە فێرخوازو منداڵانی لەبەر بکەن بە گوێرەی توانا، وە چەند فەرموودەیەکی دووبارە کردۆتەوە منیش دەستکاریم نەکردووە وەکو خۆیو لە جێگای خۆی دامناوە وەکو ئەمانەتی زانستی، وە کاری من بریتی بووە لە وەرگێڕانی فەرموودەکان نەك شەرحو راڤە کردنی، چونکە زۆر درێژ دەبوو، وە لە بنەڕەتدا ئەم پەرتووکە بۆ منداڵان دانراوەو

ئەوانیش پێویستیان بە شەرحو راڤەی درێژ نییە تەنها وەرگێڕانەکەیان بەسە کە لە ماناو مەبەستی فەرموودەکان تێ بگەن، هەروەها هەرچەندە بۆ منداڵان دانراوە بەڵام گەورەکانیش دەتوانن سودی لێ ببینن، تەنانەت مامۆستایانو ووتاربێژانو بانگخوازانیش دەتوانن بۆخۆیان سودی لێ ببینن، هەروەها هەستاوم بە دانانی حەرەکەی سەر ووشەکان بۆ ئەوەی کە هەرکەسێك خوێندییەوە یان لەبەری کرد تا بەبێ هەڵە بیخوێنێتەوەو لەبەری بکات، وە سوپاسی برای ئازیزم (محمد عبدالکریم) دەکەم کە هەستا بە نوسینی ئەم پەرتوکەو پێوەی ماندوو بوو خوا پاداشتی خێری بداتەوە، وە هەرکەسێك تێبینیو پێشنیارو ڕەخنەی هەبوو دەتوانێت بەم ژمارە تەلەفۆنە (٠٧٧٠١٢٠٧٩٧٩) پەیوەندیم پێوە بکات بە سوپاسەوە ڕەخنەو تێبینیو پێشنیارەکانتان وەردەگرینو سودی لێ دەبینین سەبارەت بەم کتابەو سەرجەم کتابەکانی ترم، داواکارم لەخوای گەورە ئەم کارەو سەرجەم کارەکانی ترمان تەنها لەبەر رەزامەندی خوای گەورە بێتو بەشی هیچ کەسی تری تێدا نەبێتو بیکاتە توێشوویەك بۆمان لە رۆژی قیامەتدا، وە ماندوو بوونمان بە زایە نەڕوات إن شاء الله، وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

**وەرگێڕ**

**هەینی ١٥ی شەعبان ١٤٣٥ ك / بەرامبەر ٢٠١٤/٦/١٣ ز**

# قۆناغی یەکەم

١- (اتَّقِ اللَّهَ حَيْثُ مَا كُنْتَ، وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ) .

واتە: لە خوا بترسە لە هەر شوێنێ بووی، وە لە دوای خراپە چاکە بکە خراپەکە دەسڕێتەوە، وە مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا بکە بە ڕەوشتی جوان.

٢- (اتَّقُوا اللَّهَ فِي الصَّلاةِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم) .

واتە: لە خوا بترسن و پارێزگاری بکەن لە نوێژەکان و باشبن لەگەڵ کەنیزەکەکانتان (جاریەکانتان) .

٣- (اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ) .

واتە: خۆتان لە ئاگری جەهەنم بپارێزن ئەگەر بە خێر کردن بێت بە لەتە خورمایەکیش.

٤- (أَتِمُّوا الْوُضُوءَ، وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ) .

واتە: دەستنوێژەکانتان بە تەواوی بگرن، وە هەڕەشەو دۆزەخ بۆ ئەو کەسانەی کە پاژنەیان تەڕ ناکەن لە کاتی دەستنوێژ شوشتندا.

٥- (اتَّقُوا الظُّلْمَ، فَإِنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) .

واتە: خۆتان لە ستەم کردن بپارێزن، چونکە ستەم کردن تاریکیە لە ڕۆژی قیامەتدا.

٦- (اتَّقُوا اللَّهَ، وَصِلُوا أَرْحَامَكُمْ) .

واتە: لەخوابترسن و پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنن.

٧- (أَحَبُّ الطَّعَامِ إِلَى اللَّهِ مَا كَثُرَتْ عَلَيْهِ الْأَيْدِي) .

واتە: خۆشەویستترین خواردن لای خوای پەروەردگار ئەوەیە کە دەستی زۆر لەسەر بێت.

٨- (إذا سَمِعْتَ النِّدَاءَ، فأجِبْ داعِيَ اللهِ) .

واتە: ئەگەر گوێت لە بانگ بوو ئەوا وەڵامی بانگخوازی خوای گەورە (بانگبێژ) بدەرەوەو بڕۆ بۆ مزگەوت.

٩- (أحَبُّ عِبادِ اللهِ الى اللهِ أحْسَنُهُمْ أخْلاقاً) .

واتە: خۆشەویستترین بەندەکانی خوا لای خوای گەورە ئەو کەسانەیە کە جوانترین ڕەوشتیان هەیە.

١٠- (إذا كانَ لأحَدِكُم شَعْرٌ فَلْيُكْرِمْهُ) .

واتە: ئەگەر یەکێ لە ئێوە قژی هەبوو با ڕێزی بگرێتو خزمەتی بکات.

١١- (إرْحَمْ مَنْ في الأرْضِ يَرْحَمْكَ مَنْ في السَّمَاءِ) .

واتە: بەبەزەی بە لەگەڵ ئەوانەی لەسەر زەوین (مرۆڤ، ئاژەڵ، باڵندە) ئەوەی لە ئاسمانە (خوای گەورە) ڕەحمت پێ دەکات.

١٢- (أفْضَلُ الإيمانِ: الصَّبْرُ والسَّمَاحَةُ) .

واتە: باشترین باوەڕ بریتیە لە ئارامگرتن و لێبوردەیی.

١٣-(إِنَّ أَبْوَابَ الْجَنَّةِ تَحْتَ ظِلَالِ السُّيُوفِ) .

واتە: بەڕاستی دەرگاکانی بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرەکاندایە.

١٤- (أَثْقَلُ شَيْءٍ فِي الْمِيزَانِ الْخُلُقُ الْحَسَنُ) .

واتە: قورسترین شت لە تەرازوی رۆژی قیامەتدا ڕەوشت جوانیە.

١٥- (أَحَبُّ الْأَعْمَالِ إِلَى اللهِ أَدْوَمُهَا وَإِنْ قَلَّ) .

واتە: خۆشەویسترین کردەوە لای خوای پەروەردگار ئەوەیە بەردەوام بێت لەسەری ئەگەر چی کەمیش بێت.

١٦-(أَحَبُّ الطَّعَامِ إِلَى اللَّهِ مَا كَثُرَتْ عَلَيْهِ الْأَيْدِي) .

واتە: خۆشەویستترین خواردن لای خوای پەروەردگار ئەوەیە کە دەستی زۆری لەسەر بێت.

١٧-(أَحَبُّ عِبادِ اللَّهِ إِلَى اللَّهِ أحْسَنُهُم أخْلاقاً) .

واتە: خۆشەویستترین بەندەکانی خوا لای خوای گەورە ئەو کەسانەیە کە جوانترین ڕەوشتیان هەیە.

١٨-(إذا أحَبَّ اللهُ قَوماً ابتلاهُم) .

واتە: ئەگەر خوای گەورە کەسانێکی خۆش بوێت تاقیان دەکاتەوە .

١٩- (إذا سَمِعْتَ النِّداءَ فأجِبْ داعِيَ اللهِ).

واتە: ئەگەر گوێت لە بانگ بوو ئەوا وەڵامی بانگخوازی خوای گەورە(بانگدەر) بدەرەوەو وەرە بۆ مزگەوت.

٢٠- (أَنَا النَّبِيُّ لَا كَذِبْ أَنَا ابْنُ عَبْدِالمطلب) .

واتە: من پێغەمبەرم بە بێ درۆ من نەوەی عَبْدِالمطلب م.

٢١- (مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ) .

واتە: هەرکەسێك لە پێناوی بەرگری کردن لە ماڵەکەی بکوژرێت ئەوا شەهیدە.

٢٢- (أَدِّ الْأَمَانَةَ إِلَى مَنِ ائْتَمَنَكَ، وَلَا تَخُنْ مَنْ خَانَكَ) .

واتە: ڕاسپاردەو ئەمانەت بگەڕێنەوە بۆ ئەو کەسەی کەلات داینـاوە، وە ناپـاکی و خیانەت مەکە تەنانەت لە کەسێکیش کە خیانەتت لێ ئەکات.

٢٣-(أكثَرُ خَطايا ابنِ آدمَ في لِسانِهِ) .

واتە: زۆربەی تاوانی مرۆڤ بە هۆی زمانیەوەیە.

٢٤- (أَكْرَمُ النَّاسِ أَتْقَاهُمْ) .

واتە: بەڕێزترینی خەڵکی لەخواترسترینیانە.

٢٥-(أمِطِ الأذى عَنِ الطَّريقِ فإنَّهُ لَكَ صَدَقَةٌ) .

واتە: ئازار لە ڕێگەی خەڵکی لابەرە ئەوا بە خێرو صەدەقە بۆت ئەنوسرێ.

٢٦- (أَنْتَ وَمَالُكَ لِأَبِيكَ) .

واتە: تۆ خۆت و ماڵەکەت موڵکی باوکتن.

٢٧-(الدَّالُّ على الخيرِ كَفاعِلِهِ) .

واتە: ئەو کەسەی ڕێنمونی خەڵکی دەکات بۆ چاکە وەکو ئەوە وایە خۆی کردبێتی.

٢٨-(إِن سَاقِيَ الْقَوْمِ آخِرُهُمْ شُرْبَاً ) .

واتە: ئەو کەسەی ئاو دەگێڕێت ئەبێت خۆی کۆتا کەس بیخواتەوە.

٢٩-(المَجَالِسُ بِالأَمَانَةِ ) .

واتە: قسەی ناو مەجلیس ئەمانەتە ئەبێت بپارێزرێت.

٣٠- (الإسلامُ يَعلُو ولا يُعْلَى) .

واتە: ئیسلام بەرزو بڵندەو هیچ دینێکی بەسەردا بەرز نابێتەوە.

٣١- (تَهَادُوا تَحَابُّوا ) .

واتە: دیاری بەیەکتر ببەخشن لەلای یەکتری خۆشەویست دەبن.

٣٢- (الْتَأنِّي مِنَ اللَّهِ، وَالْعَجَلَةُ مِنَ الشَّيْطَانِ) .

واتە: پەلەنەکردن و لەسەرخۆیی لە خوای گەورەوەیە، پەلەکردنیش لەشەیتانەوەیە.

٣٣- (خَيْرُكُمْ من تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ) .

واتە: باشترینتان ئەو کەسەیە کە خۆی فێر قورئان بێت و خەڵکیش فێر بکات.

٣٤- (الدُّنْيَا سِجْنُ المؤمِنِ وَجَنَّةُ الكَافِرِ ) .

واتە: دونیا بەندینخانەی باوەڕدارانەو بەهەشتی کافرانە.

٣٥- (الدِّينُ النَّصِيحَةُ) .

واتە: دین ئامۆژگارییە.

٣٦- (لَيسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغيرَنا، وَيُوقِّرَ كَبيرَنا) .

واتە: لە ئێمە نیە ئەوەی بە بەزەیی نەبێت لەگەڵ بچوکەکانمانداو ڕێز لە گەورەمان نەگرێت.

٣٧-(مَنْ شَهِدَ أنْ لا إلهَ إلا اللهُ دَخَلَ الجَنَّةَ ) .

واتە: هەرکەسێك شایەتی بدات بەوەی کە هیچ پەرستراوێك نیە بە حەق شایەنی پەرستن بێت جگە لە خوای گەورە ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە.

٣٨-(مَنْ لَمْ يَشْكُرِ النَّاسَ لَمْ يَشْكُرِ اللَّهَ ) .

واتە: ئەوەی سوپاسی خەڵکی نەکات سوپاسی خوای گەورەی نەکردووە.

٣٩-(مَنْ لا يَرْحَمِ النَّاسَ لا يَرْحَمْهُ اللهُ ) .

واتە: ئەوەی ڕەحم بە خەڵکی نەکات خوا ڕەحمی پیّ ناکات.

٤٠- (الْمُؤْمِنُ مِرْآةُ الْمُؤْمِنِ ) .

واتە: باوەڕدار ئاوێنەی باوەڕدارە.

٤١- (المَسْجِدُ بَيْتُ كُلِّ مُؤْمِنٍ) .

واتە: مزگەوت ماڵی هەمو باوەڕدارێکە.

٤٢- (الْمُسْلِمُ مِنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ ) .

واتە: موسڵمان ئەو کەسەیە کە موسڵمانان پارێزراو بن لە دەست و لە دەمی.

٤٣- (لايَدْخُلُ الجَنَّةَ قَتَّاتٌ) .

واتە: ئەوەی قسە بێنێت و قسە ببات بۆ ئەوەی بەینی خەڵکی تێك بداتو دوو زمانی بکات ئەوە ناچێتە بەهەشتەوە.

٤٤- (إذا لَمْ تَسْتَحِ فاصْنَعْ ما شِئْتَ) .

واتە: کە شەرمت نەکرد چی دەکەیت بیکە.

٤٥- (إِنَّ اللَّهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الجْمَالَ ) .

واتە: خوای گەورە جوانەو جوانیشی خۆش دەوێت.

٤٦-(النَّدَمُ تَوْبَةٌ ) .

واتە: پەشیمان بونەوە لە تاوان تەوبەیە.

٤٧-(الكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ ) .

واتە: ووشەی باش و جوان خێرو صەدەقەیە.

٤٨-(لاتَغْضَبْ وَلَكَ الجَنَّةُ ) .

واتە: تورە مەبە بەهەشتت بۆ هەیە.

٤٩- (الدُّعَاءُ هُوَ الْعِبَادَةُ ) .

واتە: پاڕانەوە لە خوا عیبادەت و پەرستنە.

٥٠- (مَنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ ) .

واتە: ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد با سوێند نەخوات تەنها بە خوا نەبێت.

٥١- (مَنْ كُنْتُ مَوْلَاهُ فَعَلِيٌّ مَوْلَاهُ ) .

واتە: هەرکەسێك منی خۆش دەوێت با عەلی خۆش بوێت.

٥٢- (مَنْ لَقِيَ اللهَ لايُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً دَخَلَ الجَنَّةَ ) .

واتە: هەرکەسێك بگات بە خوای گەورەو هاوبەشی بۆ بڕیار نەدابێت دەچێتە بەهەشتەوە.

٥٣-(مَنْ لَمْ يَشْكُرِ النَّاسَ لَمْ يَشْكُرِ اللَّهَ ) .

واتە: ئەوەی سوپاسی خەڵکی نەکات سوپاسی خوای گەورەی نەکردووە.

٥٤- (مَنْ نَسِيَ الصَّلاةَ عَلَيَّ خَطِئَ طَرِيقَ الجَنَّةِ ) .

واتە: ئەوەی صەلەوات دان لەسەر من لەبیر بکات ئەوا ڕێگەی بەهەشت هەڵە ئەکات.

٥٥-(مَنْ يُحْرَمِ الرِّفْقَ يُحْرَمِ الخَيْرَ كُلَّهُ ) .

واتە: هەرکەسێك بێ بەش بێت لەنەرم و نیانی ئەوە بێ بەش بووە لە هەموو خێرێك.

٥٦-(مِنْبَرِي هَذا على تُرْعَةٍ مِنْ تُرَعِ الجَنَّةِ ) .

واتە: ئەم مینبەرەی من لەسەر باخێك لە باخە بەرزەکانی بەهەشتە.

٥٧-(مُوسى بنُ عِمرانَ صَفِيُّ اللهِ ) .

واتە: موسی ی کوڕی عمران هەڵبژێردراوی خوایە.

٥٨-(أفْضَلُ القُرآنِ {الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ} ) .

واتە: باشترین سورەتی قورئان الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ە (سورەتی الفاتحە) یە.

٥٩- (أفْضَلُ أيَّامِ الدُّنيا أيَّامُ العَشْرِ ) .

واتە: باشترین ڕۆژی دونیا: دە ڕۆژی سەرەتای مانگی ذي الحجة یە .

٦٠- (أَفْشُوا السَّلَامَ بَينَكُم تَحابُّوا ) .

واتە: سڵاو لەیەکتری بکەن یەکتریتان خۆش دەوێت.

# قۆناغی دووەم

١- (آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ ) .

واتە: نیشانەی مرۆڤی دوو ڕوو سێ شتە: ئەگەر قسە بكات درۆ ئەكات، وە ئەگەر بەڵێن بدات نایباتە سەر، وە ئەگەر ئامانەتی لەلا دابنرێت خیانەتی لێ دەكات.

٢- (إذا عَطَسَ أحَدُكُمْ فَلْيَضَعْ كَفَيهِ على وَجْهِهِ وَلْيَخْفِضْ صَوتَهُ ) .

واتە: ئەگەر كەسێك لە ئێوە پژمی باهەردوو دەستی بخاتە سەر ڕووی، وە با دەنگی نزم بكات.

٣- (إذا كانَ اثْنانِ يَتَناجَيَانِ فَلا تَدْخُلْ بَينَهُما ) .

واتە: ئەگەر دوو كەس بە نهێنی قسەیان دەكرد مەڕۆ نیوانیانەوە.

٤- (أقْرَبُكُمْ مِنّي مَجْلِساً يومَ القِيامَةِ أحْسَنُكُم خُلُقاً) .

واتە: نزیكترینتان لە من لە ڕۆژی قیامەتدا ڕەوشت جوانترینتانە.

٥- (إنَّ أفْضَلَ عِبادِ اللهِ يَومَ القِيامَةِ: الحَمَّادُونَ) .

واتە: باشترین بەندەكانی خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوانەن كەوا زۆر حەمدو سوپاسی خوای گەورە دەكەن.

٦- (إنَّ اللهَ يُحِبُّ إذا عَمِلَ أحَدُكُمْ عَمَلاً أنْ يُتْقِنَهُ) .

واتە: خوای گەورە پێی خۆشە ئەگەر یەکێك لە ئێوە کارێکی کرد بەڕێکوپێکی و تەواوی بیکات.

٧- (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعَبْدَ التَّقِيَّ الْغَنِيَّ الْخَفِيَّ ) .

واتە: خوای گەورە بەندەی خۆپارێزو لەخواترسی دەوڵەمەندی نەناسراوی شاراوەی خۆش دەوێت.

٨- (الْمُتَحَابِّينَ فِي اللَّهِ في ظِلّ العَرْشِ) .

واتە: ئەوانەی بۆ خوا یەکیان خۆش دەوێت لە ژێر سێبەری عەرشی خوادان.

٩- (رَكْعَتَا الْفَجْرِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا ) .

واتە: دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی باشترە لای خوای گەورە لە دونیاو ئەوەیشی کە تێیدایە.

١٠- (رِضَا الرَّبِّ في رِضَا الوالِدَينِ، وَسَخَطُهُ في سَخَطِهِمَا) .

واتە: ڕەزامەندی خوای گەورە لە ڕەزامەندی دایك و باوکدایە، وە تورەیی خوای گەورە لە تورەیی دایك و باوکدایە.

١١- (سِباب الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ) .

واتە: جوێن دان بە موسڵمان فاسقێتی یە، وە کوشتنیشی کوفرە.

١٢-(كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ) .

واتە: دوو وشە هەیە سوکن لەسەر زمان، قورسن لەسەر تەرازووی ڕۆژی قیامەت، خۆشەویستن لای خوای گەورە، ئەویش: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ.

١٣- (كانَ صلى الله عليه وسلم إذا أكَلَ طَعَاماً لَعَقَ أصابِعَهُ الثَّلاثَةَ ) .

واتە: پێغەمبەرﷺ کە نانی بخواردایە هەرسێ پەنجەکەی دەلێسایەوە.

١٤- (لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِالَّذِي يَشْبَعُ وَجَارُهُ جَائِعٌ إِلَى جَنْبِهِ) .

واتە: ئیماندار ئەوکەسە نیە کە خۆی تێر بێت و هاوسیەکەی تەنیشتی برسی بێت.

١٥-(لَيْسَ المؤمِنُ بِالطَّعَانِ، ولا اللَّعَّانِ، ولا الفَاحِشِ، ولا البَذِيءِ) .

واتە: باوەڕدار تانەو تەشەردارو نەفرەتکارو جوێن فرۆش نیەو دەم پیس نیە.

١٦- (مِنْ حُسْنِ إِسْلَامِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مَا لَا يَعْنِيهِ) .

واتە: نیشانەی موسڵمان باشی مرۆڤ ئەوەیە واز لە کارێك بێنێت کە پەیوەندی بەوەوە نەبێت، خۆ هەڵقورتێنەر نەبێت.

١٧- (مَنْ أتَى إليكُمْ مَعروفاً فكافِئُوهُ، فَإنْ لَمْ تَجِدُوا فادْعُوا لَهُ) .

واتە: کەسێك چاکەی لەگەڵتاندا کرد ئەوا پاداشتی بدەنەوە، کە نەتان بوو پاداشتی بدەنەوە ئەوا دوعا خێری بۆ بکەن.

١٨- (مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَنْفَعَ أَخَاهُ فَلْيَنْفَعْهُ) .

واتە: هەرکەسێك لە ئێوە توانای هەبوو سود بە براکە بگەیەنێت با سودی پێ بگەیەنێت.

١٩- (الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا ) .

واتە: بڕوادار بۆ بڕوادار وەکو دیوارێك وایە کە هەندێکیان هەندێکیانی گرتبێت.

٢٠- (التَّائِبَ مِنَ الذَّنْبِ كَمَنْ لَا ذَنْبَ لَهُ ) .

واتە: تۆبەکار لەتاوان وەکو ئەو کەسە وایە کە هیچ تاوانی نەبێت.

٢١- (إذا دُعِيَ أحَدُكُمْ إلى طَعامٍ فَلْيُجِبْ، فإنْ شَاءَ طَعِمَ، وإنْ شَاءَ لَمْ يَطْعَمْ ) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە دەعوات کرا بابچێت، ئەگەر ویستی لێ بوو بابخوات، وە ئەگەر ویستی لێ نەبوو با نەخوات.

٢٢- (تَبَسُّمُكَ فِي وَجْهِ أَخِيكَ صَدَقَةٌ) .

واتە: ڕوخۆشی و زەردەخەنەت لەگەڵ براکەت خێرو صەدەقەیە.

٢٣- (اجْتَمِعُوا على طَعامِكُمْ، واذْكُرُوا اسْمَ اللهِ يُبارَكْ لَكُمْ فِيهِ) .

واتە: لەسەر خواردنەکەتان کۆ ببنەوە وە ناوی خوای لەسەر بێنن (بسم الله) بکەن خوای گەورە بەرەکەتی تێ دەکات.

٢٤- (إذا غَضِبَ أحَدُكُمْ فَلْيَسْكُتْ) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە توڕە بوو با بێ دەنگ بێت و قسە نەکات.

٢٥- (الْوَالِدُ أَوْسَطُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ) .

واتە: باوك ناوەڕاستی دەرگاکانی بەهەشتە.

٢٦- (لاتَدْخُلُ الملائِكَةُ بَيْتاً فِيه كَلْبٌ ولا صُورَةٌ) .

واتە: فریشتەی ڕەحمەت ناچێتە ماڵێکەوە کە سەگ یان وێنەی تێدا بێت.

٢٧- (لَا تُصَاحِبْ إِلَّا مُؤْمِنًا، وَلَا يَأْكُلْ طَعَامَكَ إِلَّا تَقِيٌّ) .

واتە: هاوڕێی هیچ کەس مەکە ئیلا باوەڕدار نەبێت، وە با هیچ کەس نانت نەخوات ئیلا موتەقی نەبێت.

٢٨- (لا تُكْثِرِ الضَّحِكَ، فَإِنَّ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تُمِيتُ القَلْبَ) .

واتە: زۆر پێ مەکەنە، چونکە زۆر پێکەنین دڵ دەمرێنێت.

٢٩- (يا غُلام: سَمِ اللهَ، وَكُلْ بِيَمينِكَ, وَكُلْ مِمَّا يَليكَ ) .

واتە: ئەی منالّ: بسم الله بکە، وەبە دەستی راستت بخۆ، وەلە پێش خۆتەوە بخۆ لەبەر دەستت.

٣٠- (طَلَبُ الْعِلْمِ فَرِيضَةٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ ) .

واتە: گەڕان بە دوای زانستی شەرعیدا فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێك.

٣١- (الغِيبَةُ: ذِكْرُكَ أخاكَ بِما يَكْرَهُ) .

واتە: غەیبەت ئەوەیە: باسی براکەت بکەیت بە شتێ کە پێی ناخۆش بێت.

٣٢- (الْمَاءَ طَهُورٌ لَا يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ ) .

واتە: ئاو پاکە هیچ شتێك پیسی ناکات.

٣٣- (الْمُؤَذِّنُونَ أَطْوَلُ النَّاسِ أعْنَاقاً يَوْمَ الْقِيَامَةِ) .

واتە: بانگ بێژان لەهەموو کەس گەردنیان بەرزترە لە قیامەتدا.

٣٤- (الْمُؤْمِنُ مِرْآةُ الْمُؤْمِنِ ) .

واتە: موسڵمان ئاوێنەی موسڵمانە.

٣٥- (الْمُؤْمِنُ يَمُوتُ بِعَرَقِ الجَبِينِ ) .

واتە: باوەڕدار لە کاتی مردنیدا ناوچەوانی عارەق بکات ئەوە شەهیدە.

٣٦-(المجُاهِدُ مَنْ جاهَدَ نَفْسَهُ في اللهِ) .

واتە: موجاهید ئەو کەسەیە کە جیهادی نەفسی خۆی بکات لە پێناو خوای گەورەدا.

٣٧-(الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ) .

واتە: مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەدا حەشر ئەکرێت کە خۆشی ئەوێت.

٣٨-(الْمُسْتَشَارَ مُؤْتَمَنٌ) .

واتە: ڕاوێژپێکراو دەبێت ئەمین بێت.

٣٩- (أفْشُوا السَّلامَ, وأطْعِمُوا الطَّعَامَ, وَكُونُوا إخْواناً كَما أمَرَكُمُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ) .

واتە: سلاو بلاو بکەنەوە، وەخواردن ببەخشن، وە ببن بە برا هەروەکو چۆن خوای گەورە فەرمانی پێ کردوون.

٤٠- (أفْضَلُ الإسْلامِ: الحَنيفيَّةُ السَّمْحَةُ) .

واتە: باشترین ئیسلام: یەکخواپەرستی و لێبوردەیی یە.

٤١- (أفْضَلُ الأعْمَالِ: الصَّلاةُ في أوَّلِ وَقْتِها) .

واتە: باشترین کردەوە: نوێژ کردنە لەسەرەتای کاتەکەیدا.

٤٢- (أفْضَلُ الأيَّامِ عِنْدَ اللهِ يَوْمُ الجُمُعَةِ) .

واتە: باشترین ڕۆژ لای خوای گەورە: ڕۆژی هەینی یە.

٤٣- (أَفْضَلُ الإيمانِ: الصَّبْرُ وَالسَّمَاحَةُ) .

واتە: باشترین ئیمان: ئارامگرتن و لێ بوردنە.

٤٤- (أَفْضَلُ الذِّكْرِ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَفْضَلُ الدُّعَاءِ: الْحَمْدُ لِلَّهِ) .

واتە: باشترین زیکر: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ یە وە باشترین دوعاو پاڕانەوە الْحَمْدُ لِلَّهِ یە.

٤٥- (أَفْضَلُ السَّاعَاتِ جَوفُ اللَّيلِ الآخِرِ) .

واتە: باشترین کاتەکان: سێ یەکی کۆتای شەوە.

٤٦- (أَفْضَلُ الصَّلاةِ صَلاةُ المَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلَّا المَكْتُوبَةَ) .

واتە: باشترین نوێژ: نوێژی مرۆڤە لەماڵی خۆیدا بیکات تەنها نوێژە فەرزەکان نەبێت.

٤٧- (أَفْضَلُ الصَّلَواتِ عِنْدَ اللهِ: صَلاةُ الصُّبْحِ يَومَ الجُمُعَةِ فِي جَمَاعَةٍ) .

واتە: باشترینی نوێژەکان لای خوی گەورە: نوێژی بەیانی ڕۆژی هەینی یە بە جەماعەت.

٤٨- (أَفْضَلُ العِبادَةِ الدُّعَاءُ) .

واتە: باشترین عیبادەت و پەرستن دوعاو پاڕانەوەیە لە خوای گەورە.

٤٩- (أَفْضَلُ العَمَلِ الصَّلاةُ لِوَقْتِهَا، وَالجِهَادُ فِي سَبيلِ اللهِ) .

واتە: باشترین کردار: نوێژ کردنە لە کاتی خۆیدا، وە جیهاد کردنە لە پێناو خوای گەورەدا.

٥٠- (أَفْضَلُ الكَسْبِ: بَيعٌ مَبْرُورٌ، وَعَمَلُ الرَّجُلِ بِيَدِهِ) .

واتە: باشترین دەسکەوت: فرۆشتنی چاك و حەلاڵە، وە کارێکە مرۆڤ بە دەستی خۆی بیکات.

٥١- (اقْرَءُوا سُورَةَ البَقَرَةِ فِي بُيُوتِكِمْ، فَإِنَّ الشَّيطَانَ لا يَدْخُلُ بَيْتَاً يُقْرَأُ فِيهِ سُورَةُ البَقَرَةِ) .

واتە: سورەتی البقرة بخوێنن لە ماڵەکانتاندا، چونکە بەڕاستی شەیتان ناچێتە ماڵێکەوە کە سورەتی البقرة ی تیادا بخوێنرێت.

٥٢- (أَقْرَبُ مايَكُونُ العَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ، فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ) .

واتە: نزیکترین کات کە مرۆڤ لە خواوە نزیك بێت لە کاتی سوجدە بردندایە، بۆیە زۆر تێیدا دوعا بکەن.

٥٣- (أَقْرَبُكُمْ مِنِّي مَجْلِساً يَوْمَ القِيامَةِ أَحْسَنُكُمْ خُلُقاً) .

واتە: نزیکترینتان لە من لە ڕۆژی قیامەتدا ڕەوشت جوانترینتانە.

٥٤- (أَكْبَرُ الكَبائِرِ: الإِشْرَاكُ باللهِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ، وَعُقُوقُ الوَالِدَينِ، وَشَهَادَةُ الزُّورِ) .

واتە: گـەورەترینی تاوانـە گـەورەکان: شـەریك دانانـە بـۆ خـوا، وە کوشـتنی ناحەقە، وە ئازاردانی دڵی دایك و باوکە، وە شایەتی دانی ناحەقە.

٥٥- (أَكْثِرُوا مِنْ قَوِلِ: لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلَّا بِاللهِ، فَإِنَّهَا مِنْ كُنُوزِ الجَنَّةِ) .

واتە: زۆر بڵێن لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلَّا بِاللهِ چونکە لە کەنزەکانی بەهەشتە.

٥٦- (أَكْثِرُوا ذِكْرَ هَاذِمِ اللَّذَّاتِ: الْمَوْتِ) .

واتە: زۆر یادی ئەو شتە بکەنەوە کە لەناوبەری خۆشیەکانە کە مردنە.

٥٧- (أَكْرَمُ النَّاسِ أَتْقَاهُمْ) .

واتە: بەڕێزترینی خەڵك بەتەقوا ترینیانە.

٥٨- (أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا) .

واتە: ئەو کەسەی لە هـەمو کـەس ئیمـانی تـەواوترە ئەوەیانـە کـە لەهـەمویان زیاتر ڕەوشت جوانترە.

٥٩- (الْزَمْهَا، فَإِنَّ الجَنَّةَ تَحْتَ أَقْدامِهَا) .

واتە: پەیوەست بە بەپێی دایکت، چونکە بەهەشت لەژێر پێیەکانیدایە.

٦٠- (اللَّهُمَّ اسْتُرْ عَورَتِي، وَآمِنْ رَوْعَتِي، وَاقْضِ عَنِّي دَيْنِي) .

واتە: خوایە کـەموکوڕی و ناتەواویـەکانم داپۆشـە، وە تـرس و دڵـەڕاوکێم ئـارام بکە، وە دانەوەی قەرزەکانم بۆ ئاسان بکە.

# قۆناغی سێیەم

١- (الرَّجُلُ على دِينِ خَلِيلِهِ، فَلْيَنْظُرْ أحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلْ) .

واتە: پیاو لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی، با یەکێ لە ئێوە تەماشا بکات و بزانێ هاورێیەتی کێ ئەکات.

٢- (كانَ صلى الله عليه وسلم إذا أكَلَ أو شَرِبَ قَالَ: الحَمْدُ للهِ الذي أطْعَمَ وَسَقَى وَسَوَّغَهُ وَجَعَلَ لَهُ مَخْرَجاً) .

واتە: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بیخواردایە یان بیخواردایەتەوە دەیفەرموو: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە خواردن و خواردنەوەی پێ بەخشیوین، وە چونە ژوورەوەی ئاسان کردووە، وەشوێنی دەرچونی بۆ داناوە.

٣- (مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ، وَمَا زَادَ اللَّهُ عَبْدًا بِعَفْوٍ إِلَّا عِزًّا، وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلَّهِ إِلَّا رَفَعَهُ اللَّهُ) .

واتە: بە خێرو صەدەقە ماڵ و سامان کەم ناکات، وە بەندەیەك لێبوردنی هەبێت خوای گەورە هیچی بۆ زیاد ناکات تەنها عیزەت نەبێت، وە هیچ کەسێ لەبەر خوا خۆی بەکەم نازانێ ئیلا خوا پلەو پایەی بەرز ئەکاتەوە.

٤- (مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُحْسِنْ إِلَى جَارِهِ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَسْكُتْ) .

واتە: هەرکەسێك باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە با چاکە لەگەڵ هاوسێکەیدا بکات، وە هەرکەسێ باوەڕی بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە میوانەکەی بگرێت، وە هەرکەسێك باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە با قسەی چاك بکات یان بێ دەنگ بێت.

٥- (اتَّقِ اللَّهَ حَيْثُ مَا كُنْتَ، وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ) .

واتە: لە خوا بترسە لە هەر شوێنێ بووی، وە لە دوای خراپە چاکە بکە خراپەکە دەسڕێتەوە، وە مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا بکە بە ڕەوشتی جوان.

٦- (إذا أَكَلَ أحَدُكُمْ طَعَاماً فَلْيَذْكُرِ اسْمَ اللهِ، فَإِنْ نَسِيَ أنْ يَذْكُرَ اللهَ في أوَّلِهِ فَلْيَقُلْ: بِاسْمِ اللهِ أوَّلِهِ وَآخِرِهِ) .

واتە: کە یەکێ لە ئێوە خواردنێکی خوارد با بسم الله بکات، ئەگەر لە بیری چوو لەسەرەتادا بسم الله بکات ئەوا با بڵێت: بەناوی خوا لەسەرەتاو لە کۆتاییەوە.

٧- (أَجِيبُوا الدَّاعِيَ، وَلَا تَرُدُّوا الْهَدِيَّةَ، ولا تَضْرِبُوا الْمُسْلِمِينَ) .

واتە: وەڵامی دەعوەت بدەنــەوە، وە دیـاری مەگەڕێننــەوە، وە لـە موسـڵمانان مەدەن.

٨- (إذا اسْتَطَابَ أحَدُكُمْ فَلا يَسْتَطِبْ بِيَمِينِهِ، لِيَسْتَنْجِ بِشِمالِهِ) .

واتە: کە یەکێك لە ئێوە خـۆی پـاك کـردەوە بـا بەدەسـتی ڕاسـتی خـۆی پـاك نەکاتەوە، بەڵکو بەدەستی چەپی.

٩- (إذا زَارَ أحَدُكُمْ أخَاهُ فَجَلَسَ عِنْدَهُ، فَلا يَقُومَنَّ حَتى يَسْتَأْذِنَهُ) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە سەردانی براکەی کردو لای دانیشـت بـا هەڵنەسـێت تاکو داوای ئیزنی لێ ئەکات.

١٠- (إذا غابَتِ الشَّمْسُ فَكُفُّوا صِبْيانَكُمْ، فَإنَّها سَاعَةٌ يَنْتَشِرُ فِيهَا الشَّياطِينُ) .

واتە: کـە خـۆر ئـاوا بـوو منداڵـەکانتان بەرنـە ژوورەوە، چـونکە ئـەوە کاتێکـە شەیتانەکانی تێدا بڵاو ئەبێتەوە.

١١- (إذا لَبِسْتُمْ وَإذا تَوَضَّأْتُمْ فَابْدَءُوا بِمَيامِنِكُمْ ) .

واتە: کە پۆشاکتان لەبەر کرد، وە کـە دەسـت نوێـژتان شوشـت ئـەوە لـە لای ڕاستەوە دەست پێ بکەن.

١٢- (إذا وُضِـعَ الطَّعـامُ فَخُـذُوا مِـنْ حَافَتِـهِ، وَذَرُوا وَسَـطَهُ، فَـإِنَّ البَرَكَـةَ تَنْـزِلُ فِي وَسَطِهِ) .

واتە: کە خواردن دانرا لە لایەکانیەوە بخۆن و واز لە ناوەڕاستی بێنن، چـونکە بەڕاستی بەرەکەت دائەبەزێتە ناوەڕاستی خواردنەکە.

١٣- (أَعْجَزُ النَّاسِ مَنْ عَجَزَ عَنِ الدُّعاءِ، وَأَبْخَلُ النَّاسِ مَنْ بَخِلَ بِالسَّلامِ) .

واتە: بـێ دەسـەڵاتترین کـەس ئـەو کەسـەیە کـە نـەتوانێت لـە خـوای گـەورە بپاڕێتەوە، وە ڕەزیلترین کەس ئەو کەسەیە کە چرووکی بکات لەسەلام کردن.

١٤- (أَفَضَلُ الجِهادِ كَلِمَةُ حَقٍ عِنْدَ سُلْطانٍ جَائِرٍ) .

واتە: باشـترین جیهـاد وشـەیەکی حەقـە کـە لای فەرمانڕەوایـەکی سـتەمکار بیکەیت.

١٥- (إِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وإِنَّ البِرَّ يَهْدِي الى الجَنَّةِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَصْدُقُ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللهِ صِدِّيقاً) .

واتە: بەڕاستی ڕاستگۆیی ڕێنمایت دەکات بۆ چاکە، وەچـاکەیش دەتگەیەنێتـە بەهەشت، وە مرۆڤ بەردەوام ڕاستی دەڵێت تا لای خوای گـەورە نـاونوس دەکرێـت بەڕاستگۆ.

١٦- (إِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ؛ فَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَالْفُجُورُ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَكْذِبُ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللهِ كَذَّاباً) .

واتە: ئاگادارتان دەکەمەوە لە درۆ کردن، چونکە بەڕاستی درۆ دەتبات بەرەو خراپە، وە خراپەیش دەتگەیەنێت بە ئاگری دۆزەخ، وە مرۆڤ بەردەوام درۆ ئەکات تا لای خوای گەورە ناونوس دەکرێت بە درۆزن.

١٧- (إِنَّ اللهَ تَعالَى يُبْغِضُ السَائِلَ المُلْحِفَ) .

واتە: خوای گەورە ڕقی لەسواڵکەرێکە زۆر داوا بکات و زیادەڕەوی بکات لە داواکردندا.

١٨- (إِنَّ اللَّهَ لَيَرْضَى عَنِ الْعَبْدِ أَنْ يَأْكُلَ الْأَكْلَةَ فَيَحْمَدُهُ عَلَيها، وَيَشْرَبَ الشَّرْبَةَ فَيَحْمَدُهُ عَلَيْهَا) .

واتە: بەڕاستی خوای گەورە ڕازی دەبێت لەبەندە کاتێك کە خواردنێك دەخوات و سوپاسی خوا دەکات، وە کاتێك خواردنەوەیەك بخواتەوە سوپاسی خوای لەسەر بکات.

١٩- (إِنَّ اللَّهَ تَعَالى لَيُبْغِضُ الفَاحِشَ المُتَفَحِّشَ) .

واتە: بەڕاستی خوای گەورە ڕقی لە جوێن فرۆش و قسەی ناشرینە.

٢٠- (إِنَّ لِكُلِّ دِينٍ خُلُقاً، وَإِنَّ خُلُقَ الْإِسْلَامِ الْحَيَاءُ) .

واتە: هەموو دینێك ڕەوشتی خۆی هەیە، وە ڕەوشتی ئیسلامیش شەرم كردنە.

٢١- (إنَّا نُهِينا أنْ تُرَى عَورَاتُنا) .

واتە: ئێمە قەدەغە كراوین عەورەتمان ببینرێت.

٢٢- (الإسْتِئْذانُ ثَلاثٌ، فَإنْ أُذِنَ لَكَ، وَإلَّا؛ فَارْجِعْ) .

واتە: لەدەرگادان و ئیزن وەرگرتن سێ جارە، ئەگەر ئیزنیان دایت بچۆرە ژوورەوە، ئەگەر نا بگەڕێرەوە.

٢٣- (بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ، وَحَجِّ البَيْتِ) .

واتە: ئیسلام لەسەر پێنج شت بنیات نراوە: شایەتی دان بە لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَمُحَمَّدًا وَرَسُولُ اللَّه و نوێژ كردن، و ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان، و حەجی ماڵی خوا.

٢٤- (الْبَخِيلُ مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ؛ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ) .

واتە: ڕەزیل و چروك ئەو كەسەیە كە ناوی منی لە لا بهێنرێت و صەڵاواتم لەسەر نەدات.

٢٥- (تَنَزَّهُوا مِنَ البَولِ، فَإِنَّ عَامَّةَ عَذابِ القَبْرِ مِنْهُ) .

واتە: خۆتان بە پاك ڕابگرن لە میز، چونكە زۆربەی سزای ناو گۆڕ لەبەر خۆپاك ڕانەگرتنە لە میز.

٢٦- (خَيرُ النَّاسِ مَنْ طَالَ عُمُرُهُ وَحَسُنَ عَمَلُهُ) .

واتە: باشترین کەس ئەو کەسەیە کە تەمەنی درێژ بێت و کردەوەی چاك بێت.

٢٧- (ذَاقَ طَعْمَ الْإِيمَانِ مَنْ رَضِيَ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا ) .

واتە: تام و چێژی شیرینی باوەڕی چەشتووە هەرکەسێك ڕازی بێت بە پەرروەردگاریێتی الله، و بە ئاینی ئیسلام، و بە پێغەمبەرایەتی محمدﷺ.

٢٨- (الْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْعَائِدِ فِي قَيْئِهِ) .

واتە: ئەوەی لە دیاری بەخشینەکەی پەشیمان ئەبێتەوە وەکو ئەو کەسە وایە ڕشاندنەوەی خۆی بخوات.

٢٩- (كَفَى بِالْمَرْءِ كَذِبًا أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعَ) .

واتە: بەسە بۆ مرۆڤ بەدرۆ لەسەری بنوسرێت کە هەموو شتێك بگێڕێتەوە کە بیستویەتی.

٣٠- (كانَ ﷺ إذا دَخَلَ الكَنيفَ قالَ: بِاسْمِ اللهِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أعُوذُ بِكَ مِنَ الخُبْثِ وَالخَبائِثِ).

واتە: پێغەمبەرﷺ کە بچوایەتە سەر ئاو دەیفەرموو: بەناوی خوا، خوایە پەنا بە تۆ دەگرم لە شەیتانی نێرو مێ.

٣١- (كان ﷺ إذا رأى ما يُحِبُّ؛ قالَ: الحَمْدُ للهِ الذي بِنِعْمَتِهِ تَتِمُّ الصَّالِحاتُ، وَإذا رَأى مَا يَكْرَهُ؛ قَالَ: الحَمْدُ للهِ على كُلِّ حَالٍ) .

واتە: پێغەمبەرﷺ کە شتێکی ببینیایە کە پێی خۆش بوایە دەیفەرموو: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەهۆی بەخششەکانی ئەوەوە کارە چاکەکان تەواو دەبێت، وە ئەگەر شتێکی ببینیایە کە پێی ناخۆش بوایە دەیفەرموو: سوپاس بۆ خوا لەسەر هەموو حاڵەتێك.

٣٢- (كانَ ﷺ إذا عَطَسَ وَضَعَ يَدَهُ أَوْ ثَوْبَهُ على فِيهِ، وَخَفَضَ بِها صَوتَهُ) .

واتە: پێغەمبەرﷺ ئەگەر بپژمیایە دەستی پیرۆزی یاخود پۆشاکەکەی دەخستە سەر دەمی پیرۆزی و دەنگی نزم دەکردەوە.

٣٣- (لَوْ يَعْلَمُ الَّذِي يَشْرَبُ وَهُوَ قَائِمٌ مَا فِي بَطْنِهِ؛ لَاسْتَقَاءَ) .

واتە: ئەگەر ئەو کەسەی بە پێوە ئاو دەخوات بیزانیایە چی لە سکیدایە خۆی ئەڕشاندەوە.

٣٤- (لِيأكُلْ أحَدُكُمْ بِيَمينِهِ، وَلْيَشْرَبْ بِيَمينِهِ، وَلْيَأخُذْ بِيَمينِهِ، فَإنَّ الشَّيطانَ يَأكُلُ بِشِمَالِهِ، وَيَشْرَبُ بِشِمَالِهِ، وَيُعْطِي بِشِمَالِهِ، وَيَأخُذُ بِشِمَالِهِ) .

واتە: با یەکێ لە ئێوە بە دەستی ڕاستی بخوات، وە بە دەستی ڕاستی بخواتەوە، وە بە دەستی ڕاستی شت وەربگرێت، چونکە بەراستی شەیتان بە

دەستی چەپی دەخوات، وە بە دەستی چەپی دەخواتەوە، وە بەدەستی چەپی شت دەدات، وە بەدەستی چەپی شت وەردەگرێت.

٣٥- (مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ، وَأَبْغَضَ لِلَّهِ، وَأَعْطَى لِلَّهِ، وَمَنَعَ لِلَّهِ، فَقَدِ اسْتَكْمَلَ الْإِيمَانَ) .

واتە: هەرکەسێك بۆ خوا خەڵکی خۆش بوێت، وە بۆ خوا ڕقی لە خەڵکی بێت، وە بۆ خوا ببەخشێت، وە بۆ خوا قەدەغە بکات، ئەوا باوەڕەکەی تەواوە.

٣٦- (مَنْ بَدَأَ بِالْكَلامِ قَبْلَ السَّلامِ فَلا تُجِيبُوهُ ) .

واتە: هەرکەسێك پێش سەلام کردن قسەی کرد ئەوا وەڵامی مەدەنەوە.

٣٧- (مَنْ سَتَرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ فِي الدُّنْيا سَتَرَهُ اللهُ يَومَ القِيامَةِ) .

واتە: هەرکەسێ کەموکوڕی برا موسڵمانەکەی داپۆشێ لە دنیادا ئەوا خوای گەورە کەموکوڕییەکانی دادەپۆشێ لە قیامەتدا.

٣٨- (مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ، غُرِسَتْ لَهُ نَخْلَةٌ فِي الْجَنَّةِ) .

واتە: هەرکەسێك بڵێت: سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ ئەوا دار خورمایەکی لەبەهەشتدا بۆ دەڕوێنرێت.

٣٩- (مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُحِبَّ اللهَ وَرَسُولَهُ فَلْيَقْرَأْ فِي الْمُصْحَفِ) .

واتە: هەرکەسێك پێی خۆشە کە خوای گەورەو پێغەمبەری ﷺ خۆش بوێت با لەسەر (مصحف) قورئان بخوێنێ.

٤٠- (مَنْ قَرَأَ (قَلْ هُوَ اللهُ أحَدٌ) عَشْرُ مَرَّاتٍ بَنَى اللهُ لَهُ بَيتاً فِي الجَنَّةِ ) .

واتە: هەر کەسێك دە جار (قَلْ هُوَ اللهُ أحَدٌ) بخوێنێ ئەوا خوای گەورە ماڵێکی لەبەهەشتدا بۆ دروست ئەکات.

٤١- (نَهَى رَسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم عَنِ النَّفْخِ في الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ) .

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە کە فو لە خواردن و خواردنەوە بکرێت.

٤٢- (لا تَكْشِفْ فَخِذَكَ، وَلا تَنْظُرْ إلى فَخِذِ حَيٍّ وَلا مَيِّتٍ) .

واتە: ڕانت دەرمەخەو تەماشای ڕانی زیندوو مردوو مەکە.

٤٣- (لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأخيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ) .

واتە: ئیمانی کەستان تەواو نیە تاکو ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە لە خێرو چاکە بۆ براکەیشی پێی خۆش نەبێت.

٤٤- (لَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يُرَوِّعَ مُسْلِمًا) .

واتە: حەڵاڵ نیە بۆ موسڵمان کە موسڵمان بترسێنێت.

٤٥- (اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مِسْكِينًا، وَأَمِتْنِي مِسْكِينًا، وَاحْشُرْنِي فِي زُمْرَةِ الْمَسَاكِينِ) .

واته: خوایه به هه‌ژاری بمژییه‌نیت، وه به‌هه‌ژاری بم مرێنیت، وه له کۆمه‌ڵی هه‌ژاراندا حه‌شرم بکه‌یت.

٤٦- (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي، وَوَسِّعْ لِي فِي دَارِي، وَبَارِكْ لِي فِي رِزْقِي ) .

واته: خوایه له تاوانه‌کانم خۆشبه، وه ماڵم بۆ فراوان بکه، وه به‌ره‌که‌ت بخه‌ره ناو ڕزقمه‌وه.

٤٧- (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وألحِقْنِي بِالرَّفِيقِ الأعْلَى) .

واته: خوایه لێم خۆشبه، وه ڕه‌حمم پێ بکه، وه بمگه‌یه‌نه به هاوه‌ڵی هه‌ره به‌رز.

٤٨- (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى وَالتُّقَى وَالْعَفَافَ وَالْغِنَى) .

واته: خوایه من داوای هیدایه‌ت و ته‌قواو داوێن پاکی و ده‌وڵه‌مه‌نیت لێ ئه‌که‌م.

٤٩- (اللَّهُمَّ إِنِّي أسْألُكَ مِنْ فَضْلِكَ وَرَحْمَتِكَ فَإِنَّهُ لايَمْلِكُهَا إلَّا أنْتَ ) .

واته: خوایه من داوای فه‌زڵ و چاکه و ڕه‌حمه‌تی خۆت ده‌که‌م، چونکه به‌ڕاستی که‌س خاوه‌نی نیه ته‌نها تۆ نه‌بێت.

٥٠- (اللَّهُمَّ إِنِّي أعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لايَنْفَعْ، وَعَمَلٍ لايُرْفَعْ، وَدُعَاءٍ لايُسْمَعْ) .

واتە: خوایە من پەنا بە تۆ دەگرم بمپارێزە لە زانستێك کە سودی نەبێت، وە لە کردەوەیەك کە بۆ لای تۆ بەرز نەکرێتەوە، وە لە دوعایەك کە وەڵام نەدرێتەوە.

٥١- (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ زَوَالِ نِعْمَتِكَ، وَتَحَوُّلِ عَافِيَتِكَ، وَفُجَاءَةِ نِقْمَتِكَ، وَجَمِيعِ سَخَطِكَ) .

واتە: خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە لەناو چونی بەخششەکانت، وە لە گۆڕانی سەلامەتیو پاراستننت، وەلە کتوپڕی بەڵاکەت، وە لە هەموو توڕە بوونت.

٥٢- (اللَّهُمَّ إِنِّي أعُوذُ بِكَ مِنْ عَذابِ القَبْرِ، وَأعُوذُ بِكَ مِنْ عَذابِ النَّارِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ المَحْيَا وَالمَمَاتِ، وَأعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ المَسِيحِ الدَّجَّالِ) .

واتە: خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ بمپارێزە لە سزای ناو گۆڕ، وە پەنا بە تۆ دەگرم بەتۆ بمپارێزە لە ئاگری دۆزەخ، وە پەنا بە تۆ دەگرم بمپارێزە لە تاقیکردنەوەی ژیان و مردن، وە پەنا بە تۆ دەگرم بمپارێزە لە فیتنەی مەسیحی دەجاڵ.

٥٣- (اللَّهُمَّ مَتِّعْنِي بِسَمْعِي وَبَصَرِي، وَاجْعَلْهُمَا الوَارِثَ مِنِّي، وَانْصُرْنِي عَلى مَنْ ظَلَمَنِي، وَخُذْ مِنْهُ بِثَأْرِي) .

واتە: خوایە بیستن و بینینم بپارێزەو بیانهێڵەرەوە، وە سەرم بخە بەسەر ئەو کەسەی ستەمی لێ کردووم، وە خۆت تۆڵەمی لێ بکەرەوە.

٥٤- (أُمِرْتُ أنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أنْ لَا إلهَ إلَّا اللهَ وَأنِّي رَسُولُ اللهِ، فَإذا قَالُوهَا عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأمْوالَهُمْ إلَّا بِحَقِّهَا، وَحِسَابُهُمْ عَلى اللهِ) .

واتە: فەرمانم پێ کراوە کە کوشتاری خەڵکی بکەم تا شایەتی دەدەن بە لَا إلهَ إلَّا اللهَ وَ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ، ئەگەر وتیان ئەوە خوێن وماڵیان لە من پارێزراو دەبێت تەنها بە مافی ئیسلام نەبێت، وە لێپرسینەوەیان لای خوای گەورەیە.

٥٥- (أنا زَعِيمُ بِيتٍ فِي رَبَضِ الجَنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ المِرَاءَ وَإنْ كانَ مُحِقَّاً، وَبِيتٍ فِي وَسَطِ الجَنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ الكَذِبَ وَإنْ كانَ مَازِحاً، وَبِيتٍ فِي أعْلَى الجَنَّةِ لِمَنْ حَسُنَ خُلُقُهُ) .

واتە: من کەفیلم بە ماڵێك لە لایەکانی بەهەشت بۆ کەسێك کەواز لە مشتومڕو دەمەقاڵێ بێنێت ئەگەر لەسەر حەقیش بێت، وە کەفیلم بە ماڵێك لە ناوەڕاستی بەهەشت بۆ کەسێك کەواز لەدرۆ بێنێت ئەگەر بە گاڵتەیشی بێت، وە کەفیلم بە ماڵێك لە بەرزترین شوێنی بەهەشت بۆ کەسێك کە ڕەوشتی جوان بێت.

٥٦- (أنا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَومَ القِيامَةِ وَلا فَخْرَ، وَبِيَدِي لِواءُ الحَمْدِ وَلا فَخْرَ، وَما مِنْ نَبِيٍّ يَوْمَئِذٍ آدَمُ فَمَنْ سِواهُ إلَّا تَحْتَ لِوائِي، وَأنَا أوَّلُ شافِعٍ وَأوَّلُ مُشَفَّعٍ وَلا فَخْرَ) .

واتە: من گەورەی نەوەکانی ئادەمم لە ڕۆژی قیامەتدا بە بێ فەخر و شانازی، وە ئاڵای حەمد بە دەستی منە بە بێ فەخرو شانازی، وە هیچ پێغەمبەرێك نیە لەو

ڕۆژەدا نە ئادەم و نەجگە لەو هەموویان لە ژێر بەیداخی منداں، وە من یەکەم تکاکارو تکاوەرگیراوم بە بێ فەخرو شانازی.

٥٧- (أَنَا مُحَمَّدٌ وَأَحْمَدُ والمُقَفِّي والحاشِرُ وَنَبِيُّ الرَّحْمَةِ وَنَبِيُّ الْمَلْحَمَةِ ) .

واتە: من ناوم مُحَمَّدٌ وَأَحْمَدُ والمُقَفِّي والحاشِرُ وَنَبِيُّ الرَّحْمَةِ وَنَبِيُّ الْمَلْحَمَةِ.

٥٨- (أنا وَكَافِلُ اليَتِيمِ لَهُ أوْ لِغَيرِهِ في الجَنَّةِ، والسَّاعِي عَلى الأَرْمَلَةِ وَالمِسْكِينِ كَالمُجَاهِدِ في سبيلِ اللهِ) .

واتە: من و سەرپەرشتیاری هەتیو کە هی خۆی بێت یان هی خەڵکی بێت لەبەهەشتدا پێکەوەین، وە ئەوەی خزمەتی بێوەژن و هەژار ئەکات وەك ئەو کەسە وایە کە لە پێناو خوای گەورەدا جیهاد دەکات.

٥٩- (أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللهِ في الأَرْضِ، وَالمَلَائِكَةُ شُهَدَاءُ اللهِ في السَّمَاءِ) .

واتە: ئێوە شایەتی خوان لەسەر زەوی، فریشتەکانیش شایەتی خوای گەورەن لەئاسمان.

٦٠- (إنَّ أَرْوَاحَ الشُّهَداءِ في طَيْرٍ خُضْرٍ تَعْلُقُ مِنْ ثِمَارِ الجَنَّةِ) .

واتە: بەڕاستی ڕوحی شەهیدەکان لەناو باڵندەیەکی سەوزدایە لەبەرو بومی بەهەشت دەخوات.

# قۆناغی چوارەم

١- (إذا طَبَخَ أحَدُكُمْ قِدْراً فَلْيُكْثِرْ مَرَقَهَا ثُمَّ ليُناوِلْ جارَهُ مِنْهَا) .

واتە: ئەگەر یەکێ لە ئێوە چێشتی لێنا با ئاوی زۆر تێ بکات، پاشان بەشی دراوسێکەی لێ بدات.

٢- (إنْ أرَدْتَ أنْ يُلِينَ قَلْبُكَ فَأَطْعِمْ المِسْكِينَ، وَامْسَحْ عَلى رَأسِ اليَتِيمِ) .

واتە: ئەگەر دەتەوێت دڵت نەرم بێت ئەوا خواردن بدە بە هەژاران، و دەست بەسەر هەتیوودا بهێنە.

٣- (أَكْثَرُ النَّاسِ شِبْعَاً فِي الدُّنْيَا أطْوَلُهُمْ جُوعاً فِي الآخِرَةِ) .

واتە: تێرترین کەس لە دونیادا برسیترین کەسە لە قیامەتدا.

٤- (رَحِمَ اللَّهُ عَبْدًا سَمْحًا إِذَا بَاعَ، وسَمْحًا إِذَا اشْتَرَى، وسَمْحًا إِذَا اقْتَضَى).

واتە: ڕەحمەتی خوا لە کەسێك بێت کە لێبووردە بێت لە کاتی فرۆشتندا، وە لێبوردە بێت لە کاتی کڕیندا، وە لێبوردە بێت لە کاتی بڕیارداندا.

٥- (الرَّجُلُ أحَقُّ بِمَجْلِسِهِ, وَإنْ خَرَجَ لِحَاجَتِهِ ثُمَّ عَادَ فَهُوَ أحَقُّ بِمَجْلِسِهِ) .

واتە: پیاو شایەنترە بە جێگاکەی خۆی کە لێی دانیشتووە، ئەگەر بۆ کارێك بچێت پاشان گەڕایەوە ئەو شایەنترە بە جێگاکەی خۆی.

٦- (كُلُّ أُمَّتِي يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ إِلَّا مَنْ أَبَى، مَنْ أَطَاعَنِي دَخَلَ الْجَنَّةَ وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ أَبَى) .

واتە: هەموو ئوممەتی من دەچنە بەهەشتەوە مەگەر کەسێك خۆی بەهەشت ڕەت بکاتەوە و بەهەشتی نەوێت، هەرکەسێك گوێڕایەڵیم بکات دەچێتە بەهەشتەوە وە هەرکەسێ سەرپێچیم بکات ئەوا خۆی بەهەشتی نەویستووە.

٧- (كانَ ﷺ إِذَا خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ قَالَ: بِسْمِ اللَّهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ، ولَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ ) .

واتە: پێغەمبەر ئەگەر لە ماڵ دەربچوایە دەیفەرموو: بەناوی خوا پشتم بەست تەنها بە خوا، هیچ هێزو توانایەك نیە جگە بە یارمەتی خوا.

٨- (لَيْسَ الشَّدِيدُ بِالصُّرَعَةِ، إِنَّمَا الشَّدِيدُ الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الغَضَبِ) .

واتە: پاڵەوانی بە زۆرانبازی نیە، بەڵکو پاڵەوان ئەو کەسەیە کە خۆی دەگرێت لە کاتی توڕەبووندا.

٩- (مُرُوا أَوْلَادَكُمْ بِالصَّلَاةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ، وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرِ سِنِين، وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ) .

واتە: فەرمان بە منداڵەکانتان بکەن بە نوێژ کردن لە تەمەنی حەوتساڵیدا، وە لێیان بدەن لەسەری ئەگەر نەیانکرد تەمەنیان گەیشتە دە ساڵ، وە جێگای نوستنیان لێك جیا بکەنەوە.

١٠- (مَنْ أخْرَجَ مِنْ طَرِيقِ المُسْلِمِينَ شَيْئاً يُؤْذِيهِمْ كَتَبَ اللهُ لَهُ بِهِ حَسَنَةً، وَمَنْ كَتَبَ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً أدْخَلَهُ اللهُ بِهَا الجَنَّةَ) .

واتە: هەرکەسێك شتێك لەسەر ڕێگای موسڵمانان لابدات کە ئازاریان پێ دەگەیەنێت ئەوا خوای گەورە بە چاکە بۆی دەنوسێت، وە لای خوا چاکە بۆ هەرکەسێك بنوسرێت ئەوا بە هۆیەوە خوا دەیخاتە بەهەشتەوە.

١١- (مَنِ اسْتَعَاذَكُمْ بِاللَّهِ فَأَعِيذُوهُ، وَمَنْ سَأَلَكُمْ بِاللَّهِ فَأَعْطُوهُ، وَمَنْ دَعَاكُمْ فَأَجِيبُوهُ، وَمَنْ صَنَعَ إِلَيْكُمْ مَعْرُوفًا فَكَافِئُوهُ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا مَا تُكَافِئُونَهُ فَادْعُوا اللَّهَ لَهُ حَتَّى تَرَوْا أَنْ قَدْ كَافَأْتُمُوهُ) .

واتە: هەرکەسێك پەنای پێتان گرت بە خوای گەورە ئەوا پەنای بدەن، وە هەرکەسێك داوای لێتان کرد لەبەر خوای گەورە ئەوا بیدەنێ، وە هەرکەسێك دەعوەتی کردن ئەوا وەڵامی بدەنەوە، وە هەرکەسێك چاکەیەکی لەگەڵ کردن ئەوا پاداشتی بدەنەوە، ئەگەر هیچتان نەبوو پاداشتی بدەنەوە ئەوا ئەوەندە دوعای بۆ بکەن هەتا دەزانن کە پاداشتان داوەتەوە.

١٢- (مَنْ قَرَأَ الْآيَتَيْنِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ ) .

واتە: هەرکەسێك دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی بەقەرە بخوێنێت لە شەودا ئەوە بەسیەتی.

١٣- (مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ ) .

واتە: هەرکەسێك کە خوای گەورە خێری بۆی بوێت ئەوا لە دین شارەزای دەکات.

١٤- (لَا تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيءٍ إذا فَعَلْتُمُوه تَحَابَبْتُم؟ " أَفْشُوا السَّلامَ بَينَكُمْ) .

واتە: ناچنە بەهەشتەوە تا باوەڕ نەهێنن، وە باوەڕ ناهێنن تا یەکتریتان خۆش نەوێت، ئایا ڕێنمایتان بکەم بۆ شتێك کە بیکەن یەکتریتان خۆش بوێت؟ سڵاو لەیەکتری بکەن.

١٥- (لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَلَدِهِ وَوَالِدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ) .

واتە: ئیمانی هیچ کەسێکتان تەواو نیە تا منی لەلا خۆشەویستتر نەبێت لە منداڵەکانی و لەباوکی و لەسەرجەم خەڵکی.

١٦- (وَيْلٌ لِمَنْ يُحَدِّثُ فَيَكْذِبُ لِيُضْحِكَ بِهِ الْقَوْمَ، وَيْلٌ لَهُ، وَيْلٌ لَهُ) .

واتە: واتە: هەڕەشەو دۆزەخ بۆ ئەو کەسەی کە درۆ ئەکات بۆ ئەوەی خـەڵکی پێبکەنێت، هاوارو دۆزەخ بۆ ئەو کەسە، هاوارو دۆزەخ بۆ ئەو کەسە.

١٧- (لا تَدْخُلُ الملائِكَةُ بَيْتاً فِيهِ تَمَاثِيلٌ أو تَصَاوِيرٌ) .

واتە: واتە: فریشتەی ڕەحمەت ناچێتە ماڵێکەوە کە پەیکەرو وێنەی تێدا بێت.

١٨- (لاتُطْعِمُوا المساكِينَ مِمَّا لا تَأْكُلُونَ ) .

واتە: ئەوەی کە خۆتان نایخۆن مەیدەن بە هەژاران.

١٩- (لا تَقْتُلُوا الجَرَادَ، فَإِنَّهُ مِنْ جُنْدِ اللهِ الأَعْظَمِ ) .

واتە: کوللـە مـەکوژن، چـونکە بەڕاسـتی سـەربازی هــەرە گـەورەی خـوای گەورەیە.

٢٠- (لا تَلاعَنُوا بِلَعْنَةِ اللهِ وَلا بِغَضَبِهِ ولا بِالنَّارِ) .

واتە: نەفرەت مەکەن بە نەفرەتی خـوا، یـان تورەبـوونی خـوا، یـان دۆزەخـی خوا.

٢١- (أَثْقَلُ شَيْءٍ فِي الْمِيزَانِ الخُلُق الحَسَنُ ) .

واتە: قورسترین شت لەتەرازووی ڕۆژی دواییدا ڕەوشت جوانیە.

٢٢- (إِذَا سَـقَطَتْ لُقْمَـةُ أَحَـدِكُمْ فَلْـيُمِطِ الْأَذَى عَنْهَـا وَلْيَأْكُلْهَـا وَلَا يَـدَعْهَا لِلشَّيْطَانِ).

واته: ئەگەر پارووی یەکێکتان لە دەستی بەرەوە بوو ئەوا با پاکی بکاتـەوە و بیخوات بە جێی نەهێڵێت بۆ شەیتان.

٢٣- (إذا أكَلَ أحَدُكُمْ طَعَامَاً فَلْيَلْعَقْ أصَابِعَهُ، فَإِنَّهُ لا يَدْرِي فِي أيِّ طَعَامِهِ تَكُونُ البَرَكَةُ) .

واته: ئەگەر یەکێك لە ئێوە خـواردنی خـوارد ئـەوا بـا پـەنجـەکانی بلێسـێتەوە، چونکە بەڕاستی ئەو نازانێت بەرەکەت لەناو کام خواردنەدایە.

٢٤- (إنَّ اللهَ عَـزَّ وَجَـلَّ حَيِـيٌّ سِـتِّيرٌ يُحِـبُّ الحَيَـاءَ وَالسِّـتْرَ، فَـإِذَا اغْتَسَـلَ أحَـدُكُمْ فَلْيَسْتَتِرْ) واته: خوای گەورە زۆر بەشەرمەو زۆر کەموکوڕی دادەپۆشێت، وە شـەرم داپۆشینی کەموکوڕی خۆش دەوێت، بۆیە ئەگەر یەکێك لە ئێوە خۆی شوشت ئەوا با خۆی داپۆشێت و نەبینرێت.

٢٥- (لأنْ يَقُومَ أحَدُكُمْ أرْبَعِينَ خَيرٌ لَهُ مِنْ أنْ يَمُرَّ بَينَ يَدي المُصَلِّي) .

واته: ئەگـەر یـەکێك لـەئێوە چـل ڕابوەسـتێت باشـترە بـۆی لـەوەی لـە پـێش نوێژخوێنێکەوە بڕوات.

٢٦- (كَانَ إِذَا رَأَى الْهِلَالَ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَهِلَّهُ عَلَيْنَا بِالْأَمْنِ وَالْإِيمَانِ وَالسَّلَامَةِ وَالْإِسْلَامِ رَبِّي وَرَبُّكَ اللَّهُ») .

واته: پێغەمبەر ﷺ كە مانگی یەك شەوەی ببینیایە دەیفەرموو: خوایە دەریخە بۆمان بە خێر و بەرکەت و ئیمان وسەلامەتیو ئیسلام، ئەی مانگ پەروەردگاری من و تۆ الله یە.

٢٧- (لا يُقيمُ الرَّجُلُ الرَّجُلَ مِنْ مَجْلِسِهِ ثُمَّ يَجْلِسُ فِيهِ، وَلكِنْ تَفَسَّحُوا أَوْ تَوَسَّعُوا ).

واته: با پیاو پیاو لە جێی خۆی هەڵنەسێنێت و پاشان لێی دانیشێت، بەڵکو جێگای یەکتری بکەنەوەو فراوان دانیشن.

٢٨- (إِنَّ مِنْ أَشَدِّ النَّاسِ بَلاءً الأَنْبِياءُ، ثُمَّ الذينَ يَلُوْنَهُمْ، ثُمَّ الذينَ يَلُونَهُمْ) .

واته: بەڕاستی لە هەموو کەس تاقیکردنەوەی سەختتر بێت پێغەمبەرانن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان .

٢٩- (إِنَّ أَقْرَبَكُمْ مِنِّي مَنْزِلاً يَوْمَ القِيامَةِ: أَحاسِنُكُمْ أَخْلاقاً في الدُّنْيا) .

واته: بەڕاستی نزیکترین کەستان لە منەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕەوشت جوانترینتانە لە دونیادا.

٣٠- (إِنَّ الإِسْلامَ بَدَأَ غَرِيباً، وَسَيَعُودُ غَرِيباً كَمَا بَدَأَ، وَهُوَ يَأْرِزُ بَينَ المَسْجِدَينِ كَمَا تَأْرِزُ الحَيَّةُ فِي جُحْرِهَا ) .

واتە: بەڕاستی ئیسلام لەسەرەتادا بە غەریبی و نامۆیی دەستی پێ کرد، وە بە غەریبیو نامۆیی دەگەڕێتەوە هەروەکو چۆن دەستی پێ کرد، وەئیسلام کۆ دەبێتەوەو یەك دەگرێت لە نێوان هەردوو مزگەوتەکەدا هەروەکو چۆن مار خۆی لە کونەکەیدا کۆدەکاتەوە.

٣١- (إِنَّ البَرَكَةَ تَنْزِلُ فِي وَسَطِ الطَّعَامِ، فَكُلُوا مِنْ حَافَتِهِ، وَلَا تَأْكُلُوا مِنْ وَسَطِهِ ) .

واتە: بەڕاستی بەرەکەت دادەبەزێتە ناوەڕاستی خواردن، بۆیە ئێوە لە لایەکانیەوە بخۆن و لە ناوەڕاستەوە مەخۆن.

٣٢- (إِنَّ الجَنَّةَ لَتَشْتَاقُ إِلَى ثَلَاثَةٍ: عَلِيٍّ وَعَمَّارٍ وَسَلْمَانَ ) .

واتە: بەڕاستی بەهەشت تامەزرۆی سێ کەسە: علی و عەممار و سەلمان (خوایان لێ ڕازی بێت).

٣٣- (إِنَّ الحَسَنَ وَالحُسَيْنَ هُمَا رَيْحَانِيَّ مِنَ الدُّنْيَا) .

واتە: ئەم دوو کوڕەی من حەسەن و حسێن (خوایان لێ رازی بێت) پشوو ئارامی و بۆن خۆشی منن لە دونیادا.

٣٤- (إِنَّ الدَّجَّالَ مَمْسُوحُ العَينِ اليُسْرَى، عَلَيْهَا ظَفْرَةٌ، مَكْتُوبٌ بَين عَيْنَيْهِ كَافِرْ ) .

واتە: بەڕاستی دەججال چاوی چەپی کوێرە، وە گۆشتێکی زیادەی لەسەر شۆڕ بۆتەوە، لە نێو چاوانی نوسراوە: کافر.

٣٥- (إِنَّ الدُّنْيَا مَلْعُونَةٌ، مَلْعُونٌ مَا فِيهَا، إِلا ذِكْرَ اللهِ وَمَا وَالاَهُ وَعَالِماً أَوْ مُتَعَلِّماً )

واتە: بەڕاستی دونیا دوورە لەڕەحمەتی خوا وە ئەوەیشی تێیدایە لە شتی دونیایی دوورە لەڕەحمەتی خوا، تەنها زیکری خواو لەو جۆرانە لەپەرستن، و زانایان و فێرخوازانی زانستی شەرعی نەبێت.

٣٦- (إِنَّ الرَّجُلَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ خُلُقِهِ دَرَجَةَ الْقَائِمِ بِاللَّيلِ الظَّامِئِ بِالْهَوَاجِرِ) .

واتە: بەڕاستی مرۆڤ بەهۆی ڕەوشت جوانیەوە دەگاتە پلەی پیاوێك کە بەشەو شەونوێژ بکات و بەڕۆژی زۆر گەرم بەڕۆژوو بێت.

٣٧- (إِنَّ السَّعِيدَ لَمَنْ جُنِّبَ الْفِتَنَ، وَلَمَنِ ابْتُلِيَ فَصَبَرَ ) .

واتە: بەڕاستی بەختەوەر ئەو کەسەیە کە خۆی دوور بخاتەوە لە فیتنە، وە کە تاقی کرایەوەو توشی بەڵا و ناخۆشی بوو ئارام بگرێت.

٣٨- (إِنَّ السَّلَامُ اسْمٌ مِنْ أَسْمَاءِ اللَّهِ تَعَالَى، وَضَعَهُ اللَّهُ فِي الْأَرْضِ، فأفْشُوا السَّلامَ بَيْنَكُمْ).

واتە: بەڕاستی السلام ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خوای گەورە، خوای گەورە دایناوە لەسەر زەوی بۆ ئەوەی ئێوە زۆر سەلام لەیەکتری بکەن.

٣٩- (إِنَّ الشَّيْطَانَ قَدْ أَيِسَ أَنْ يَعْبُدَهُ الْمُصَلُّونَ وَلَكِنْ فِي التَّحْرِيشِ بَيْنَهُمْ) .

واتە: بەڕاستی شەیتان بێ ئومێد بووە لەوەی کە نوێژخوێنان بیپەرستن، بەڵام بێ ئومێد نەبووە لەشەڕ و ئاژاوە خستنە نێوانیانەوە.

٤٠- (إنَّ اللهَ احْتَجَرَ التَّوبَةَ عَلى كُلِّ صَاحِبِ بِدْعَةٍ) .

واتە: بەڕاستی خوای گەورە هەموو خاوەن بیدعەیەکی بێ بەش کردووەو قەدەغەی کردووە لە تەوبە.

٤١- (إنَّ اللهَ إذا أحَبَّ قَوْمَاً ابْتَلاهُمْ فَمَنْ صَبرَ فَلَهُ الصَّبْرُ وَمَنْ جَزِعَ فَلَهُ الجَزَعُ ).

واتە: بەڕاستی ئەگەر خوای گەورە کەسانێکی خۆش بوێت تاقیان دەکاتەوە، جا هەرکەسێك ئارام بگرێت ئەوا ئارامگرتنی بۆ هەیە، وە هەرکەسێك نائارام بێت ئەوا نائارامی بۆ هەیە.

٤٢- (إنَّ اللهَ إذا أحَبَّ أهْلَ بَيتٍ أدْخَلَ عَلَيهِمْ الرِّفْقَ) .

واتە: **بەراستی** خوای گەورە ئەگەر خانەوادەیەکی خۆش بوێت ئەوا نەرم نیانی دەخاتە ناویان.

٤٣- (إنَّ اللهَ تَعَالَى اطَّلَعَ عَلى أهْلِ بَدْرٍ فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ).

واتە: خوای گەروە تەماشای ئەهلی بەدری کردو فەرمووی: چ کارێك دەکەن بیکەن چونکە بەڕاستی من لێتان خۆش بوومە.

٤٤- (إنَّ اللهَ تَعَالَى جَمِيلٌ يُحِبُّ الجَمَالَ، وَيُحِبُّ مَعَالِيَ الأَخْلاقِ وَيَكْرَهُ سَفْسَافَهَا) .

واتە: بەڕاستی خوای گەورە جوانەو جوانی خۆش دەوێت، وە ڕەوشتە بەرزو جوانەکانی خۆش دەوێت و ڕەوشتی نزم و سوکی پێ ناخۆشە.

٤٥- (ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ وَاخْتِلَافِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، وَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْء فَدَعُوهُ ) .

واتە: لێم گەڕێن لەوەی کە خۆم وازم لێتان هێناو بۆتانم باس نەکرد، چونکە ئوممەتانی پێش ئێوە تەنها ئەوەی لەناوی بردن زۆری پرسیار کردن و جیاوازیان بوو لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان، ئەگەر فەرمانم بەشتێك پێتان کرد ئەوا بە گوێرەی توانای خۆتان جێ بەجێی بکەن، وە ئەگەر شتێکم لێتان قەدەغە کرد ئەوا وازی لێ بهێنن.

٤٦- (رُبَّ أَشْعَثَ مَدْفُوعٍ بِالْأَبْوَابِ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لَأَبَرَّهُ ) .

واتە: لەوانەیە کەسێکی قژ گڤ پاڵ پێوەنراو و دەرکراو لە دەرگاکان، ئەگەر سوێند بخوا کە خوای گەورە کارێکی بۆ ئاسان بکات ئەوا خوا بۆی دەکات و وەڵامی دەداتەوە.

٤٧- (رَحِمَ اللهُ عَبْداً قَالَ خَيراً فَغَنِمَ، أَوْ سَكَتَ عَنْ سُوءٍ فَسَلِمَ) .

واتە: ڕەحمەتی خوا لەکەسێك بێت کە باش بلێت و پاداشت وەربگرێت لەسەری، یان بێدەنگ دەبێت و قسەی خراپ ناکات پارێزراو بێت لەتاوان.

٤٨- (رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيقِظَ، وَعَنِ الْمُبْتَلَى حَتَّى يَبْرَأَ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَكْبَرَ) .

واتە: قەڵەم هەڵگیراوە لەسەر سێ کەس: لەسەر خەوتو تا بەخەبەر دێت، وە لەسەر شێت تا چاك دەبێت، وە لەسەر منداڵ تا بالغ دەبێت و گەورە دەبێت.

٤٩- (زَيِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ، فإِنَّ الصَّوْتَ الحَسَنَ يَزِيدُ القُرْآنَ حُسْناً) .

واتە: قورئان بڕازێننەوە بە دەنگتان، چونکە بەراستی دەنگی خۆش جوانی و خۆشی قورئان زیاد دەکات.

٥٠- (سَأَلْتُ رَبِّي ثَلَاثًا فَأَعْطَانِي ثِنْتَيْنِ وَمَنَعَنِي وَاحِدَةً، سَأَلْتُ رَبِّي أَنْ لَا يُهْلِكَ أُمَّتِي بِالسَّنَةِ فَأَعْطَانِيهَا، وَسَأَلْتُهُ أَنْ لَا يُهْلِكَ أُمَّتِي بِالْغَرَقِ فَأَعْطَانِيهَا، وَسَأَلْتُهُ أَنْ لَا يَجْعَلَ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ فَمَنَعَنِيهَا) .

واتە: داوای سێ شتم کرد لە خوای گەورە دوانی وەڵام دامەوەو پێی بەخشیم یەکێکیانی پێ نەبەخشیم، داوام کرد لە پەروەردگارم ئوممەتەکەم لەناو نەبات بە بێ بارانیو وشکە ساڵی پێمی بەخشی، وە داوام لێ کرد کە ئوممەتەکەم لەناو

نەبات بە نوقم بوون و نگرۆ بوون لە ئاودا ئەوەیشی پـێ بەخشـیم، وە داوام لێکـرد کە شەڕو ئاژاوەیان لە ناودا نەبێت ئەوەی پێ نەبەخشیم.

٥١- (الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ، وَالْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ، مُكَفِّرَاتٌ لَمَّا بَيْنَهُنَّ إِذَا اجْتُنِبَتِ الْكَبَائِرُ) .

واتە: پێنج نوێژە فەرزەکـە، وە هـەینی بـۆ هـەینی، وە ڕەمـەزان بـۆ ڕەمـەزان دەبنە هۆی سڕینەوەی تاوانەکانی نێوانیان ئەگەر خۆت لە تاوانی گەورە بپارێزیت.

٥٢- (طَلَبُ العِلْمِ فَرِيضَةٌ عَلى كُلِّ مُسْلِمٍ، وَإِنَّ طَالِبَ العِلْمِ يَسْتَغْفِرُ لَهُ كُلُّ شَيءٍ حَتَّى الحِيتانُ فِي البَحْرِ) .

واتە: گەڕان بەدوای زانستی شەرعی فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێك، بەڕاستی فێرخوازی زانستی شـەرعی هـەموو شـتێك داوای لـێ خـۆش بـوونی بـۆ دەکـات لـە خوای گەورە تەنانەت نەهەنگەکانی دەریایش.

٥٣- (طُوبَى لِمَنْ وَجَدَ فِي صَحِيفَتِهِ اسْتِغْفَارًا كَثِيرًا) .

واتە: بەختەوەری و بەهەشت بۆ کەسێك کە لەپەڕاوی کردەوەکانیدا استغفر الله ی زۆر تێدا بێت.

٥٤- (طَهِّرُوا أَفْنِيَتَكُمْ فَإِنَّ اليَهُودَ لا تُطَهِّرُ أَفْنِيَتَهَا) .

واتە: بەردەم ماڵتان پاك بكەنەوە، چونكە بەڕاستی جولەكە بەردەم ماڵیان پاك ناكەنەوە.

٥٥- (طُوبَى لِمَنْ مَلَكَ لِسَانَهُ وَ وَسِعَهُ بَيْتُهُ وَبَكَى عَلى خَطِيئَتِهِ) .

واتە: بەختەوەری و بەهەشت بۆ كەسێك كە بەسەر زمانی خۆیدا زاڵ بێت و زمانی ڕابگرێت، وە لە ماڵی خۆی بمێنێتەوە، وە بۆ تاوان و هەڵەی خۆی بگری.

٥٦- (أُوصِيكَ بِتَقْوَى اللَّهِ، وَالتَّكْبِيرِ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ ) .

واتە: وەسیەتت بۆ دەكەم تەقوای خوای گەورە بكە، وەلەسەر هەموو شوێنە بەرزەكان الله اكبر بكە.

٥٧- (عَلَيْكِ بِالرِّفْقِ؛ فَإِنَّهُ لَا يَكُونُ فِي شَيْءٍ إِلَّا زَانَهُ، وَلَا يُنْزَعُ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا شَانَهُ) .

واتە: پەیوەست بە بەنەرم ونیانیەوە، بەڕاستی نەرم و نیانی لەهیچ شتێكدا نابێت ئیلا جوانی دەكات، وە لە هیچ شتێك نەرم ونیانی دەرناكرێت ئیلا ناشرینی دەكات.

٥٨- (عَلَيْكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ لِلَّهِ، فَإِنَّكَ لَا تَسْجُدُ لِلَّهِ سَجْدَةً إِلَّا رَفَعَكَ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً، وَحَطَّ بِهَا عَنْكَ خَطِيئَةً) .

واتە: زۆر سوجدە بۆ خوای گەورە بەرە، چونکە تۆ بێ گومان هیچ سوجدەیەك بۆ خوا نابەیت ئیلا بە هۆیەوە خوای گەورە پلەیەك بەرزت دەكاتەوە، وە تاوانێكت لێ دەسڕێتەوە.

٥٩- (عَينانِ لا تَرَيانِ النَّارَ: عَينٌ بَكَتْ وَجَلاً مِنْ خَشْيَةِ اللهِ، وَعَينٌ باتَتْ تَكْلأُ في سَبيلِ اللهِ).

واتە: دوو چاو ئاگر نابینن: چاوێك بگری لە ترسی خوای گەورە، وە چاوێك پاسەوانی بكات لە پێناو خوای گەورە.

٦٠- (فَضْلَ الْعَالِمِ عَلَى الْعَابِدِ كَفَضْلِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ عَلَى سَائِرِ الْكَوَاكِبِ) .

واتە: فەزڵ و گەورەیی مرۆڤی زانا بەسەر مرۆڤی خواپەرست وەكو فەزڵ و گەورەیی مانگی چواردە وایە بەسەر تێكڕای ئەستێرەكاندا.

# قۆناغی پێنجەم

١- (أَتُحِبُّونَ أَيُّهَا النَّاسُ أنْ تَجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ؟ قُولُوا: اللّهُمَّ أعِنَّا عَلى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ) .

واتە: ئەی خەڵکینە ئایا پێتان خۆشە کۆشش بکەن لە پاڕانەوەدا؟ بڵێن: خوایە یارمەتیمان بدە لەسەر زیکرو سوپاس کردن و جوان پەرستنی تۆ.

٢- (أَتَدْرُونَ مَا الْغِيبَةُ؟» ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ) .

واتە: ئایا ئەزانن غەیبەت چییە؟ ئەوەیە کە باسی براکەت بکەیت بە شتێك کە پێی ناخۆش بێت.

٣- (إذا كانَ أحَدُكُمْ يُصَلِّي فَلا يَرْفَعْ بَصَرَهُ إلى السَّمَاءِ) .

واتە: کەیەکێك لە ئێوە نوێژی کرد باچاو بەرز نەکاتەوە بۆ ئاسمان.

٤- (إذا كانَوا ثَلاثَةً فَلا يَتَناجِّ اثْنانِ دُونَ الثَّالِثِ مِنْ أجْلِ أنَّ ذلِكَ يُحْزِنُهُ) .

واتە: ئەگەر سێ کەس بوون با دووانتان بەیەکەوە بەنهێنی قسە نەکات، چونکە بەڕاستی سێ یەم خەفەتبار دەبێت.

٥- (ازْهَدْ فِي الدُّنْيَا يُحِبُّكَ اللَّهُ، وَازْهَدْ فِيمَا عِنْدَ النَّاسِ يُحِبُّكَ النَّاسُ ) .

واتە: دونیانەویست بە خوا خۆشی دەوێیت، خۆت بێ پێویست بکە لەوەی لە دەستی خەڵکیدایە خەڵکی خۆشیان دەوێیت.

٦- (إِنَّ فِيكَ لَخَصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ تَعَالى: الْحِلْمُ وَالأَنَاةُ ) .

واتە: تۆ دوو ڕەوشتت تێدایە خوای گەورە خۆشی دەوێن، ئەویش: لێبوردەیی و نەرەمو نیانیو لەسەرخۆییو پەلە نەکردنە.

٧- (إِنَّ مِنْ أَكْبَرِ الكَبائِرِ: أنْ يَلْعَنَ الرَّجُلُ وَالِدَيهِ: يَلْعَنُ أبَا الرَّجُلِ فَيَلْعَنُ أباهُ، وَيَلْعَنُ أمَّهُ فَيَلْعَنُ أمَّهُ) .

واتە: بەڕاستی لەهەرە تاوانە گەورەکان ئەوەیە کە: مرۆڤ نەفرەت بکات لە دایك و باوکی: نەفرەت لە باوکی خەڵکی بکات ئەوانیش نەفرەت لە باوکی ئەم بکەن، وە نەفرەت لە دایکی خەڵك بکات ئەوانیش نەفرەت لە دایکی ئەم بکەن.

٨- (إِنَّ هَذِهِ ضَجْعَةٌ يُبْغِضُهَا اللهُ تَعالى – يَعني الاضْطِجَاعُ على البَطْنِ) .

واتە: ئەمە ڕاکشانێکە کە خوای گەورە رقی لێیەتی: واتە ڕاکشان لەسەر سك.

٩- (تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً) .

واتە: پاش شێو بکەن چونکە بەڕاستی بەرەکەت لە پاش شێو کردندا هەیە.

١٠- (الْبِرُّ: حُسْنُ الْخُلُقِ، وَالْإِثْمُ: مَا حَاكَ فِي صَدْرِكَ، وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ)

واتە: چاکە بریتی یە لە ڕەوشت جوانی، وە خراپەیش ئەوەیە کە دڵت پێی ناخۆش بێت و دڵ تەنگ بیت پێی و گومانت لێی هەبێت، وە پێت ناخۆش بێت کە خەڵکی بیبینێت و هەستی پێ بکات.

١١- (تَعَرَّفْ إِلَى اللهِ فِي الرَّخَاءِ يَعْرِفْكَ فِي الشِّدَّةِ ) .

واتە: خوا بناسە لە کاتی خۆشیدا خوای گەورەیش فریات دەکەوێت لە کاتی سەغڵەتیدا.

١٢- (حُرِّمَ عَلَى النَّارِ كُلُّ هَيِّنٍ لَيِّنٍ سَهْلٍ قَرِيبٍ مِنَ النَّاسِ ) .

واتە: حەرام کراوە لەسەر ئاگری دۆزەخ هەموو کەسێکی ئاسانی سادەی نەرم و نیانی ساناى نزیك لە خەڵکی بسوتێنێت.

١٣- (حَسِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ، فَإِنَّ الصَّوْتَ الْحَسَنَ يُزِيدُ الْقُرْآنَ حُسْنًا) .

واتە: قورئان بڕازێننەوە بە دەنگتان چونکە بەراستی دەنگی خۆش جوانی قورئان زیاد دەکات.

١٤- (حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ خَمْسٌ: رَدُّ السَّلَامِ، وَعِيَادَةُ الْمَرِيضِ، وَاتِّبَاعُ الْجَنَائِزِ، وَإِجَابَةُ الدعْوَة، وَتَشْمِيتُ الْعَاطِسِ).

واتە: مافی موسڵمان بەسەر موسڵمانەوە پێنج شتە: وەڵامدانەوەی سەلام، و سەردانی کردنی نەخۆش، و شوێن کەوتنی جەنازە، و وەڵامدانەوەی دەعوەت، و کەسێکیش پژمی وتی الحمد لله تۆ پێی بڵێی یرحمك الله.

١٥- (دَخَلَتِ امْرَأَةٌ النَّارَ فِي هِرَّةٍ رَبَطَتْهَا؛ فَلَا هِيَ أَطْعَمَتْهَا, وَلَا هِيَ أَرْسَلَتْهَا تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الْأَرْضِ – حَتَّى ماتَتْ ) .

واتە: ئافرەتێك لە پێناو پشیلەیەكدا چووە ناو ئاگری دۆزەخەوە، بەستبۆیەوە نەخواردنی پێ دەدا نەوازی لێ دەهێنا خۆی خۆراك لەسەر زەوی پەیدا بكات و ڕاو بكات تا تۆپی.

١٦- (كانَ ﷺ إذا سَمِعَ المُؤَذِّنَ قَالَ مِثْلَ ما يَقولُ حَتَّى إذا بَلَغَ ( حَيَّ عَلى الصَّلاةِ حَيَّ عَلى الفَلاحِ ) قَالَ: لا حَولَ وَلا قُوَّةَ إلا بِاللهِ ) .

واتە: پێغەمبەر ﷺ كە گوێی لە دەنگی بانگبێژ بوایە وەكو ئەوی دەوتەوە تا دەگەیشتە حَيَّ عَلى الصَّلاةِ حَيَّ عَلى الفَلاحِ ئەو كاتە دەیفەرموو: لا حَولَ وَلا قُوَّةَ إلا بِاللهِ.

١٧- (مَثَلُ المُؤمِنينَ في تَوادِّهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ كَمَثَلِ الجَسَدِ الواحِدِ إذا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَداعَى لَهُ سائِرُ الأعْضاءِ بِالسَّهَرِ وَالحُمَّى) .

واتە: نمونـەی بـاوەڕداران لـە خۆشەویسـتی و ڕەحـم و بـەزەیی و سـۆزیاندا بەرامبەر یەکتری وەکو یەك لاشەیەك وایە کە ئەگەر ئەندامێکی ئـەو لاشـەیە ئـازای هەبێت ئەوا سەرجەم ئەندامەکانی تریشی توشی شەونخونی و تا دەبن.

١٨- (مَثَلُ الْبَيْتِ الَّذِي يُذكَرُ اللَّهُ فِيهِ وَالْبَيْتِ الَّذِي لَا يُذْكَرُ اللهُ فِيهِ مَثَلُ الحَيِّ وَالمَيِّتِ) .

واتە: نمونەی ئەو ماڵەی کە یادی خوای تیا دەکرێت لەگـەڵ ئـەو مالـەی زیکـرو یادی خوای تیا ناکرێت وەکو مرۆڤی زیندوو مردوو وایە.

١٩- (مَنْ أَحَبَّ أَنْ تَسُرَّهُ صَحِيفَتُهُ فَلْيُكْثِرْ فِيها مِنَ الإسْتِغْفارِ) .

واتە: هەرکەسێك پێی خۆشە پەڕاوی کردەوەکانی لە ڕۆژی دواییدا دڵـی خـۆش بکات ئەوا با زۆر استغفر الله بکات.

٢٠- (مِنْ حِينَ يَخْرُجُ أحَدُكُمْ مِنْ مَنْزِلِهِ إلى مِسْجِدِهِ؛ فَرِجْلٌ تُكْتَبُ لَهُ حَسَنَةٌ، وَأُخْرَى تَمْحُو سَيِّئَةً ) .

واتە: لـەو کاتـەی یـەکێ لـەئێوە لـە مـاڵی خـۆی دەردەچـێت بـۆ مزگـەوت هەنگاوێکی چاکەی بۆ دەنوسرێت و هەنگاوێکی تری خراپەیەکی لێ دەسڕێتەوە.

٢١- (مَنْ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنَ الرِّفْقِ؛ فَقَدْ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنَ الْخَيْرِ؛ وَمَنْ حُرِمَ حَظَّهُ مِنَ الرِّفْقِ؛ فَقَدْ حُرِمَ حَظَّهُ مِنَ الْخَيْرِ ) .

واتە: هەرکەسێك بەشی خۆی لە نەرم و نیانی پێ درابێت ئەوا بەشی خۆی لە خێرو چاکە وەرگرتووە، وە هەرکەسێك بێ بەش کرابێت لە نەرم و نیانی ئەوا بێ بەش کراوە لە خێرو چاکە.

٢٢- (مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْكَهْفِ فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ أَضَاءَ لَهُ مِنَ النُّورِ مَا بَيْنَ الْجُمُعَتَيْنِ ) .

واتە: هەرکەسێك سورەتی کەهف بخوێنێ لە ڕۆژی هەینیدا ئەوا نێوان هەردوو هەینیەکەی بۆ ڕوناك دەکاتەوە لە نور.

٢٣- (مَنْ كانَ لَهُ وَجْهَانِ فِي الدُّنْيا؛ كانَ لَهُ يومَ القِيامَةِ لِسَانَانِ مِنْ نَارٍ ) .

واتە: هەرکەسێك لە دونیا دوو ڕووی هەبێت ئەوا لە ڕۆژی دواییدا دوو زمانی دەبێت لە ئاگر.

٢٤- (مَنْ كَذَّبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدَاً فَلْيَتَبَوَّأ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ ) .

واتە: هەرکەسێك بە قەستی و بە عەمدی درۆ بکات بەدەم منەوە ئەوا با شوێنێك لە ئاگری دۆزەخ بۆ خۆی دابنێت.

٢٥- (مَنْ يَكُنْ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ؛ يَكُنِ اللهُ فِي حَاجَتِهِ) .

واتە: هەرکەسێك پێویستی برایەکی جێ بەجێ بکات ئەوا خوای گەورە پێداویستیەکانی بۆ جێ بەجێ دەکات.

٢٦- (الْمُؤَذِّنُونَ أَطْوَلُ النَّاسِ أعْنَاقاً يَوْمَ الْقِيَامَةِ ) .

واتە: بانگبێژان لە هەموو کەس گەردنیان بەرزترە لە ڕۆژی قیامەتدا.

٢٧- (المُؤمِنُ مَنْ أمِنَهُ النَّاسُ عَلى أمْوالِهِمْ وَأنْفُسِهِمْ، وَالمُهاجِرُ مَنْ هَجَرَ الخَطَايَا وَالذُنُوبَ) .

واتە: باوەڕدار ئەو کەسەیە کە خەڵکی ئەمین بن لێی لەسەرو لەگیانیان، کۆچکەریش ئەو کەسەیە کە دەس هەڵگرێت و واز بهێنێت لە گوناهو تاوان.

٢٨- (لا يَأْخُذَنَّ أحَدُكُمْ مَتَاعَ صَاحِبِهِ لاعِباً وَلا جَادًّا، وَإنْ أَخَذَ عَصَا صَاحِبِهِ فَلْيَرُدَّهَا عَلَيهِ).

واتە: بایەکێ لەئێوە شتومەکی هاوڕێکەی نەبات نە بەگاڵتە نەبەڕاستی، وە ئەگەر گۆچانی هاوڕێکەی برد ئەوا با بۆی بگەڕێنێتەوە.

٢٩- (مَنْ شَهِدَ أنْ لا إلَهَ إلَّا اللهُ دَخَلَ الجَنَّةَ ) .

واتە: هەرکەسێك شایەتی بدات کەوا هیچ پەرستراوێك بە حەق شایەنی پەرستن نیە جگە لە الله ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە.

٣٠- (إذا تَثَاءَبَ أحَدُكُمْ فَلْيَرُدَّهُ مَا اسْتَطَاعَ، فَإنَّ أحَدَكُمْ إذا قَالَ: هَا، ضَحِكَ مِنْهُ الشَّيْطَانُ).

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە باوێشکی دا ئەوا چەندێك لەتوانایدا هەبوو با بیگەڕێنێتەوە، چونکە بەراستی ئەگەر یەکێك لە ئێوە ووتی: ها، ئەوا شەیتان پێی پێ دەکەنێت.

٣١- (كَـانَ ﷺ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِـهِ؛ قَـالَ الحَمْـدُ للهِ الـذي أطْعَمَنَـا وَسَـقَانَا وَكَفَـانَا وَآوَانَا فَكَمْ مِمَّنْ لا كَافِيَ لَهُ وَلا مُؤْوِي لَهُ) .

واتە: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بچوایەتە سەر جێگای نوستن دەیفەرموو: حەمدو سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە خوادن و خواردنەوەی پێ بەخشین و بێ پێویستی کردین هەر خۆیمان بەسە، وە جێگای پێ داین کە چەندەها کەس هەیە بێ کەس و بێ جێگایە.

٣٢- (إذا اسْتَلْقَى أحَدُكُمْ عَلى قَفَاهُ فَلا يَضَعْ إحْدَى رِجْلَيهِ عَلى الأُخْرَى) .

واتە: ئەگەر کەسێك لە ئێوە لەسەر پشتی ڕاکشا با قاچێکی نەخاتە سەر قاچەکەی تری.

٣٣- (إذا أصْبَحَ أحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ بِكَ أصْبَحْنَا وَبِكَ أمْسَينَا وَبِكَ نَحْيَا وَبِكَ نَمُوتُ وَإلَيكَ النُّشُورُ ) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە بەیانی کردەوە بابڵێت: خوایە بە پشتیوانی تۆوە بەیانیمان کردەوەو بە پشتیوانی تۆوە ئێوارەمان کردەوە وە بە پشتیوانی تۆوە دەژین و بە پشتیوانی تۆوە دەمرین و گەڕانەوەیشمان هەر بۆ لای تۆیە.

٣٤- (إِذَا انْتَعَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِالْيَمِينِ وَإِذَا خَلَعَ فَلْيَبْدَأ بِالشِّمَالِ، لِتَكُونَ الْيُمْنَى أَوَّلَهُمَا تُنْعَلُ وَآخِرَهُمَا تُنْزَعُ ) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە پێڵاوی لەپێ کرد با لە پێی ڕاستەوە دەس پێ بکات، وە ئەگەر دایکەند با لەچەپەوە دەست پێ بکات، با ڕاستە یەکەمیان بێت کە لە پێ دەکرێت وە دواییان پێت کە دادەکەندرێ.

٣٥- (مَنْ عَلِمَ الرَّمْيَ ثُمَّ تَرَكَهُ؛ فَلَيسَ مِنَّا ) .

واتە: هەرکەسێك نیشان شکاندن بزانێت پاشان وازی لێ بهێنێت ئەوا لە ئێمە نی یە.

٣٦- (مَوْقِفُ سَاعَةٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِنْ قِيَامِ لَيْلَةِ الْقَدْرِ عِنْدَ الْحَجَرِ الأَسْوَدِ) .

واتە: ڕاوەستانی کاتێکی کەم لە پێناو خوای گەورە لە جیهاد کردندا باشترە لەڕاوەستانی شەوی قەدر بۆ پەرستن لەلای بەردە ڕەشەکە لە کەعبەی پیرۆز.

٣٧- (مَنْ أَنْفَقَ نَفَقَةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ كُتبَتْ لَهُ بِسَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ ) .

واتە: هەركەسێك شتێك ببەخشێت لە پێناو خوای گەورەدا ئەوا بەحەود سەد بۆی دەنوسرێت.

٣٨- (المَهْدِيُّ مِنَّا أَهْلَ البَيْتِ يُصْلِحُهُ اللهُ فِي لَيلَةٍ ) .

واتە: محەمەدی مەهدی لە ئێمەیە لە ئال و بەیتی منە خوای گەورە لەشەوێكدا ئامادەی دەكات.

٣٩- (نَهْرَانِ مِنْ الجَنَّةِ: النِّيلُ وَالفُرَاتُ ) .

واتە: دوو ڕوبار هەن لەبەهەشتن: نیل و فورات.

٤٠- (النَّارُ عَدُوٌّ فَاحْذَرُوهَا ) .

واتە: ئاگر دوژمنە ئاگاداری بن.

٤١- (النَّاسُ وَلَدُ آدَمَ، وَآدَمُ مِنْ تُرَابٍ ) .

واتە: خەڵكی نەوەی ئادەمن، وە ئادەمیش لە خۆڵە.

٤٢- (لا تَسُبُّوا الدَّهْرَ، فَإِنَّ اللهَ هُوَ الدَّهْرُ ) .

واتە: جوێن بە سەردەم و ڕۆژگار مەدەن، چونكە بەڕاستی رۆژگار بە دەست خوایە خوا هەڵی دەسوڕێنێت و بەڕێوەی دەبات.

٤٣- (لا تَغْضَبْ وَلَكَ الجَنَّةُ ) .

واتە: توڕە مەبەو بەهەشتت بۆ هەیە.

٤٤- (فُكُّوا العَانِي، وَأجِيبُوا الدَّاعِيَ، وَأطْعِمُوا الجَائِعَ، وَعُودُوا المَرِيضَ) .

واتە: دیل ئـازاد بکـەن، و وەڵامـی دەعـوەت بدەنـەوە، و برسـی تێـر بکـەن، و سەردانی نەخۆش بکەن.

٤٥- (فِي الجَنَّةِ مَا لا عَينٌ رَأَتْ، وَلا أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلا خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ) .

واتە: لەبەهەشتدا نازو نیعمەتی وا هەیە کە هیچ چـاوێك نـەیبینیووە، وە هـیچ گوێیەك نەیبیستووە، وە بە دڵی هیچ مرۆڤێکدا نەهاتووە.

٤٦- (الفِقْهُ يَمَانٍ، وَالحِكْمَةُ يَمَانِيَّةٌ) .

واتە: فیقهو تێگەیشتن لە دین یەمەنی یە، وە حیکمەت و داناییش یەمەنیە.

٤٧- (قَالَ اللهُ تَعَالَى: " الكِبْرِيَاءُ رِدَائِي، فَمَنْ نَازَعَنِي رِدَائِي قَصَمْتُهُ) .

واتە: خوای گەورە دەفەرمێت: گەورەیی‌و خۆبەگەورەزانین تایبەتە بە من، جا هەرکەسێك داوای بکات‌و خۆبەگەورەزانینی تێدا بێت ئەوا زەلیل‌و ریسوای دەکەم‌و نزیکە لەناوی ببەم، چونکە ئەم سیفەتە بۆ مرۆڤ ناگونجێت‌و کەم‌و کوڕییـە. (چـۆن کەسـێك پۆشـاکێکی هـەبێت تایبـەت بێـت بـە خـۆی ئـاوایش گـەورەیی‌و خۆبەگـەورەزانین تایبەتـە بـە خـوای گـەورەو سـیفەتێکی مـەدح‌و بـەرزو بڵنـدە سەبارەت بە خوای گەورە)

٤٨- (كَتَبَ اللهُ تَعَالَى مَقَادِيرَ الخَلائِقِ قَبْلَ أنْ يَخْلُقَ السَّمَواتِ وَالأرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، وَعَرْشُهُ عَلى الماءِ) .

واتە: خوای گەورە قەدەری دروستکراوەکانی نوسیووە پێش ئەوەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست بکات بە پەنجا هەزار ساڵ، وە عەرشەکەیشی لەسەر ئاوە.

٤٩- (لَصَوْتُ أبِي طَلْحَةَ فِي الجَيْشِ خَيرٌ مِنْ أَلْفِ رَجُلٍ ) .

واتە: دەنگی ئەبو تەلحە (خوای لێ رازی بێت) لەناو سوپادا باشترە لە هەزار پیاو.

٥٠- (لَوْ كَانَتِ الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ مَا سَقَى كَافِرًا مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ).

واتە: ئەگەر دونیا نرخی باڵە مێشولەیەکی هەبوایە لای خوای گەورە ئەوا قومە ئاوێکی لێ نادا بە کافر.

٥١- (لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ ) .

واتە: ئەگەر نارەحەتی نەبوایە لەسەر ئوممەتەکەم ئەوا فەرمانم پێیان دەکرد بە سیواك کردن لەگەڵ هەموو نوێژێکدا.

٥٢- (لَيسَ الكَذَّابُ بِالذي يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ فَيَنْمِيَ خَيراً وَيَقُولَ خَيراً ) .

واتە: ئەو کەسە درۆزن نیە کە نێوانی خەڵك چاك دەکات و قسەی باش دێنێت و دەبات و باش دەڵێت.

٥٣- (ما جَلَسَ قَومٌ يَذْكُرونَ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ إلَّا نَادَاهُمْ مُنادٍ مِنَ السَّماءِ: قُومُوا مَغْفُوراً لَكُمْ).

واتە: هیچ کەسانێك دانانیشن لە شوێنێکدا زیکری خوای گەورە بکەن ئیلا بانگکەرێك لە ئاسمانەوە بانگیان دەکات و پێیان دەڵێت: هەستن خوای گەورە لێتان خۆش بووە.

٥٤- (مالِي وَلِلدُّنْيا؟ مَا أنا في الدُّنْيا إلا كَراكِبٍ اسْتَظَلَّ تَحْتَ شَجَرَةٍ، ثُمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا) .

واتە: من دونیام بۆ چیە! من لە دونیادا وەکو سوارێك وام کە لە ژێر سێبەری دارێکدا پشوو بدات و پاشان بڕوات و بە جێی بهێڵێت.

٥٥- (ما مِنْ عَامٍ إلّا وَالذي بَعْدَهُ شَرٌّ مِنْهُ حَتَّى تَلْقَوا رَبَّكُمْ ) .

واتە: هیچ ساڵێك نیە ئیلا دواتری خراپترە لە خۆی تا دەگەنە خوای گەورە.

٥٦- (ما مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ تَوَضَّأَ فَأَسْبَغَ الوُضُوءَ ثُمَّ صَلَّى لِلّهِ في كُلِّ يَومٍ ثِنْتَي عَشْرَةَ رَكْعَةً تَطَوُعاً غَيرَ فَرِيضَةٍ إلَّا بَنَى اللهُ لَهُ بَيْتاً في الجَنَّةِ) .

واتە: هیچ بەندەیەکی موسڵمان نیە دەست نوێژ بشوات و دەست نوێژێکی تەواو پاشان لە هەموو ڕۆژێکدا بۆ خوا دوانزە ڕکاتی سوننەتی پێش و پاشی نوێژە فەرزەکان بکات جگە لە فەرزەکان ئیلا خوای گەورە کۆشکێکی لەبەهەشتدا بۆ دروست دەکات.

٥٧- (ما مِنْ قَومٍ يَذكُرونَ اللهَ إلَّا حَفَّتْ بِهِمُ المَلائِكَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَنَزَلَتْ عَلَيهِمُ السَّكِينَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ).

واتە: هیچ کەسانێك نیە زیکری خوای گەورە بکەن ئیلا فریشتەکان دەوریان دەدەن و بەدەوریاندا دەسوڕێنەوە، وە سۆزو بەزەیی خوای گەورە دایاندەپۆشێت، وە هێمنی و ئارامی دادەبەزێتە سەریان، وە خوای گەورە لای فریشتەکانی لای خۆی بە چاکە باسیان دەکات.

٥٨- (مَا مِنْ يَوْمٍ يُصْبِحُ الْعِبَادُ فِيهِ إِلَّا مَلَكَانِ يَنْزِلَانِ فَيَقُولُ أَحَدُهُمَا: اللَّهُمَّ أعْطِ مُنْفِقًا خَلَفًا، وَيَقُولُ الْآخَرُ: اللَّهُمَّ أَعْطِ مُمْسِكًا تَلَفاً ) .

واتە: هی ڕۆژێك نیە کەبەندەکان ڕۆژی تیا بکەنەوە ئیلا دوو فریشتە دادەبەزن یەکێکیان دەڵێت: خوایە ئەوەی ماڵی خۆی لەپێناو تۆدا دەبەخشێت ئەوا جێگەی بۆ پڕ بکەرەوە و پێی ببەخشە، ئەوی تریان دەڵێت: خوایە ئەوەی ماڵی خۆی

نابەخشێت و دەستی خۆی گردۆتەوە ئەوا ماڵەکەی توشی لەناو چون بکەیت و لەناوی بەریت.

٥٩- (ما مِنْكُمْ مِنْ أحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُحْسِنُ الوُضُوءَ ثُمَّ يَقُومُ فَيَرْكَعُ رَكْعَتَينِ يُقْبِلُ عَلَيهِمَا بِقَلْبِهِ وَ وَجْهِهِ، إلَّا وَجَبَتْ لَهُ الجَنَّةُ وَغُفِرَ لَهُ ) .

واتە: هیچ کەسێك لە ئێوە نیە کە دەست نوێژ بشوات و جوان و تەواو دەست نوێژ بشوات پاشان هەستێت دوو رکات نوێژ بکات دڵو بیرو رووی لای نوێژەکەی بیت، ئیلا بەهەشت بۆ ئەو مسۆگەرو واجب دەبێت و خوا لە تاوانەکانی خۆش دەبێت.

٦٠- (مَثَلُ الْبَيْتِ الَّذِي يُذْكَرُ اللَّهُ فِيهِ وَالْبَيْتِ الَّذِي لَا يُذْكَرُ اللهُ فِيهِ مَثَلُ الحَيِّ وَالمَيِّتِ)

واتە: نمونەی ئەو ماڵەی زیکری خوای گەورەی تیا دەکرێت و ئەو ماڵەی زیکری خوای گەورەی تێدا ناکرێت وەکو نمونەی زیندو و مردوو وایە.

# قۆناغی شەشەم

١- (اتَّقُوا دَعْوَةُ الْمَظْلُومِ فَإِنَّهَا تُحْمَلُ عَلَى الْغَمَامِ، وَيَقُولُ اللهُ: وَعِزَّتِي وجَلالِي لأَنْصُرَنَّكَ وَلَوْ بَعْدَ حِينٍ ) .

واتە: خۆتان بپارێزن لە دوعای ستەم لێکراو وستەم مەکەن، چونکە ئەو دوعایە هەڵدەگیرێ لەسەر هەوری سپی و بەرز دەکرێتەوە، خوای گەورە دەفەرمێت: سوێند بێت بە عیززەت و گەورەیی خۆم سەرت دەخەم ئەگەر دواتریش بێت.

٢- (إذا جَاءَ رَمَضَانُ فُتِحَتْ أبْوابُ الجَنَّةِ، وَغُلِّقَتْ أبْوابُ النَّارِ، وَصُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ) .

واتە: کە مانگی ڕەمەزان بێت دەرگاکانی بەهەشت دەکرێتەوە، وە دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێت، وە شەیتانەکان کۆت و زنجیر دەکرێن.

٣- (إِذَا سَرَّتْك حَسَنَتُكَ وَسَاءَتْكَ سَيِّئَتُكَ فَأَنْتَ مُؤْمِنٌ ) .

واتە: ئەگەر چاکەکەت دڵخۆشی کردیت و خراپەکەت خەفەتباری کردیت ئەوا تۆ باوەڕداری.

٤- (إذا كانَ يَومُ الجُمُعَةِ وَلَيلَةِ الجُمُعَةِ فَأَكْثِرُوا مِنَ الصَّلاةِ عَلَيَّ ) .

واتە: کە شەو و ڕۆژی هەینی بوو زۆر سەڵاوات لەسەر من بدەن.

٥- (إذا نَسِيَ أَحَدُكُمْ صَلاةً أوْ نامَ عَنْهَا فَلْيُصَلِّها إذا ذَكَرَهَا ) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە لەیادی چوو نوێژێکی بکات یاخود خەوی لێ کەوت بەسەریدا ئەوا هەرکات یادی کەوتەوە با بیکات.

٦- (أرْبَعٌ أفْضَلُ الكَلامِ لا يَضُرُّكَ بِأَيِّهِنَّ بَدَأْتَ: سُبْحَانَ اللهِ، وَالحَمْدُ للهِ، وَلَا إلهَ إلَّا اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ) .

واتە: باشترین وشە چوارە زیانت پێ ناگەیەنێت بە هەرکامێکیان دەست پێ بکەیت: سُبْحَانَ اللهِ، وَالحَمْدُ للهِ، وَلَا إلهَ إلَّا اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ.

٧- (أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ ساجِد فَأَكْثِرُوا مِنَ الدُّعَاءِ ) .

واتە: نزیکترین کات کە بەندە لە خوای خۆی نزیك بێتەوە لە سوجدەدایە بۆیە تێیدا زۆر دوعا بکەن.

٨- (أكْبَرُ الكَبَائِرِ: الإشْرَاكُ بِاللهِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ، وَعُقُوقُ الوَالِدَينِ، وَشَهَادَةُ الزُّورِ ) .

واتە: گەورەترین تاوانە گەورەکان: هاوبەش بڕیاردانە بۆ خوا، وە ئازاردانی دڵی دایك و باوکە، وە شایەتی دانی ناحەقە.

٩- (امْلِكْ عَلَيْكَ لِسَانَكَ، وَلِيَسَعَكَ بَيْتُكَ، وَابْكِ عَلَى خَطِيئَتِكَ).

واتە: زمانت بگرە(بپارێزە)، وە لە ماڵ خۆت جێگیربە(لە كاتی فیتنەدا)، وە بۆتاوانەكانی خۆت بگری.

١٠- (أُمِرْتُ بِالسِّواكِ حَتَّى خِفْتُ عَلى أسْنَانِي ) .

واتە: فەرمانم پێ كرا بە سیواك كردن تاترسام لە ددانەكانم.

١١- (إنَّ أكْمَلَ المُؤمِنِينَ إيماناً أحْسَنُهُمْ خُلُقاً، وَإنَّ حُسْنَ الخُلُقِ لَيَبْلُغُ دَرَجَةَ الصَّومِ والصَّلاةِ) .

واتە: بەڕاستی لە هەموو باوەڕدارێك ئیمانی تەواوتر ئەو كەسەیە كە لە هەموویان ڕەوشتی جوانتر بێت، وە ڕەوشت جوانی پلەی باوەڕدار بەرز دەكاتەوە تا دەیگەیەنێتە پلەی ڕۆژوو نوێژ.

١٢- (إنَّ الدِّينَ النَّصِيحَةُ، لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ ) .

واتە: بەڕاستی دین ئامۆژگارییە بۆ خواو قورئانەكەی و پێغەمبەرەكەی ﷺ و پێشەوایانی موسڵمانان و سەرجەم موسڵمانان.

١٣- (إنَّ اللهَ تَعَالى أوْحَى إلَيَّ أنْ تَواضَعُوا حَتَّى لا يَبْغِي بَعْضُكُمْ على بَعْضٍ) .

واتە: خوای گەورە سروشی بۆ ناردم كە خۆتان بەكەم بزانن تا هەندێكتان ستەم لە هەندێكتان نەكەن.

١٤- (إنَّ اللهَ زادَكُمْ صَلاةً فَحافِظُوا عَلَيها وَهِيَ الوِتْرُ) .

واتە: خوای گەورە نوێژێکی بۆتان زیاد کردووە پارێزگاری لێ بکەن کە ویترە.

١٥- (إنَّ اللهَ تَعَالى لا يَقْبَلُ مِنَ العَمَلِ إلَّا مَا كانَ لَهُ خَالِصاً وَابْتُغِيَ بِهِ وَجْهُهُ ) .

واتە: خوای گەورە هیچ کردەوەیەك وەرناگرێت تەنها ئەوە نەبێت کە بەدڵسۆزی و نیەت پاکی بۆ ئەو ئەنجام درابێت و مەبەست پێی تەنها ڕەزامەندی ئەو بێت.

١٦- (إنَّ اللَّهَ تَعَالى لَا يَنْظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ، وَلَكِنْ يَنْظُرُ إلى قُلُوبِكُمْ وَأعْمالِكُمْ) .

واتە: خوای گەورە تەماشای شێوەو ماڵتان ناکات بەڵکو تەماشای دڵ و کردەوەکانتان دەکات.

١٧- (إنَّ اللَّهُ تَعَالَى يَقُولُ: أَنَا مَعَ عَبْدِي مَا ذَكَرَنِي وَتَحَرَّكَتْ بِي شَفَتَاهُ ) .

واتە: خوای گەورە دەفەرمێت: من لەگەڵ بەندەی خۆمدام تا یادو زیکری من بکات و لێوەکانی بجولێتەوە بە یادی من.

١٨- (إن شَرّ النَّاس مَنْزِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ تَرَكَهُ النَّاسُ اتِّقَاءَ فُحْشِهِ ) .

واتە: بەڕاستی خراپترین کەس لە لای خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو کەسەیە کە خەڵکی وازی لێ بێنن لەبەر خۆپاراستن لە خراپەکاری‌و جوێن فرۆشی.

١٩- (إِنَّ حُسْنَ العَهْدِ مِنَ الإِيمانِ ) .

واتە: بەڕاستی پەیمان باشی و بردنە سەری لە ئیمانەوەیە.

٢٠- (إِنَّ لِلَّهِ تعالى مَلَائِكَةً سَيَّاحِينَ فِي الْأَرْضِ يُبَلِّغُونِي مِنْ أُمَّتِيَ السَّلَامَ ) .

واتە: بەڕاستی خوای گەورە لەسەر زەوی فریشتەی گەڕۆکی هەیەکە سەلامی ئوممەتەکەمم پێ دەگەیەنن.

٢١- (إِنَّ لِلَّهِ تَعَالَى تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ ) .

واتە: بەڕاستی خوای گەورە نەوەدو نۆ ناوی هەیە هەرکەسێك بیژمێرێت و لەبەری بکات و لە خۆیدا جێبەجێی بکات ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە.

٢٢- (إِنَّ لِلطَّاعِمِ الشَّاكِرِ مِنَ الأَجْرِ مِثْلَ مَا لِلصَّائِمِ الصَّابِرِ ) .

واتە: بەڕاستی ئەو کەسەی کە دەخوات و سوپاسگوزاری خوای گەورە دەکات ئەجرو پاداشتی بۆ هەیە وەکو کەسێکی ڕۆژووەوانی ئارامگر.

٢٣- (إِنَّ مِنْ أَرْبَى الرِّبَا الِاسْتِطَالَةُ فِي عِرْضِ الْمُسْلِمِ بِغَيْرِ حَقٍّ ) .

واتە: بەڕاستی گەورەترین ڕیباو سو خواردن دەم درێژی کردنە ناموسی موسڵمانە بە ناحەق.

٢٤- (إِنَّ مِنْ شَرِّ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِنْدَ اللَّهِ ذَا الْوَجْهَيْنِ ) .

واتە: بەڕاستی خراپترین خەڵکی لای خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو کەسەیە کە دوو ڕووی هەیە.

٢٥- (إِنَّمَا بُعِثْتُمْ مُيَسِّرِينَ وَلَمْ تُبْعَثُوا مُعَسِّرِينَ) .

واتە: ئێوە تەنها نێردراون بۆ ئەوەی ئاسانکار بن، وە نەنێردراون بۆ ئەوەی شت لەسەر خەڵکی قورس بکەن.

٢٦- (التَّائِبُ مِنَ الذَّنْبِ كَمَنْ لَا ذَنْبَ لَهُ ) .

واتە: تۆبەکار لە تاوان وەکو ئەو کەسە وایە هیچ تاوانی نەکردبێت.

٢٧- (خابَ عَبْدٌ وَخَسَرَ لم يَجْعَلِ اللهُ تَعَالى فِي قَلْبِهِ رَحْمَةً لِلبَشَرِ) .

واتە: زەرەرمەندو خەسارەتمەند ئەو کەسەیە کە خوای گەورە ڕەحم و بەزەیی خەڵکی نەخستبێتە دڵیەوە.

٢٨- (لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ ) .

واتە: ئەگەر زەحمەت نەبوایە لەسەر ئوممەتەکەم ئەوا فەرمانم پێ دەکرن بە سیواک کردن لەگەڵ هەموو نوێژێکدا.

٢٩- (مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، وَأَنْ يُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ ) .

واتە: هەرکەسێك پێی خۆشە ڕزق و ڕۆزی فراوان بکرێت، و تەمەنی درێژ بکرێت، ئەوا با پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنێت.

٣٠- (المؤمِنُ يَأْلَفُ وَيُؤْلَفْ، وَلا خَيْرَ فِيمَنْ لا يَأْلَفُ وَلا يُؤْلَفُ، وَخَيرُ النَّاسِ أنْفَعُهُمْ لِلنَّاسِ).

واتە: باوەڕدار ئەو کەسەیە کەوا نەرمونیانەو تێکەڵ خەڵکی دەبێت و خەڵکی تێکەڵی دەبن، وە خێر لەو کەسەدا نیە کە نەرم و نیان نەبێت و تێکەڵ خەڵکی نەبێت و خەڵکی تێکەڵی نەبێت، وە باشترینی خەڵکی ئەو کەسەیە کە لە هەموو کەس بەسودترە بۆ خەڵکی.

٣١- (لا تَحْلِفُوا إلا بِاللهِ وَلا تَحْلِفُوا إلا وَأنْتُمْ صَادِقُونَ) .

واتە: سوێند مەخۆن بە خوای گەورە نەبێت، وە سوێند مەخۆن ئیلا کە ئێوە ڕاستگۆبن.

٣٢- (لَا تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ، وَلَا لِذِي مِرَّةٍ سَوِيٍّ) .

واتە: زەکات حەڵاڵ نیە بۆ دەوڵەمەند وەری بگرێت، هەروەها بۆ کەسێکی بەهێزی لەش ساغ.

٣٣- (لَا طَاعَةَ لِمَخْلُوقٍ فِي مَعْصِيَةِ الْخَالِقِ ) .

واتە: نابێت گوێڕایەڵی هیچ کەسێك بکرێت لەسەرپێچی خوای گەورەدا.

٣٤- (مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ الْدائِمِ الذي لَا يَفْتُرُ مِنْ صِيَامٍ وَلَا صَدقةٍ حَتَّى يَرْجِعَ ) .

واتە: نمونەی کەسێك کە جیهاد دەکات لە پێناو خوای گەورەدا وەکو کەسێك وایە کە بە ڕۆژ بەڕۆژوو بێت و بەشەو شەونوێژ بکات بەبەردەوامی کە بێزار نەبێت لە ڕۆژوو خێر کردن تا دەگەڕێتەوە.

٣٥- (مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَقَدْ غَزَا، وَمَنْ خَلَفَ غَازِيًا فِي أَهْلِهِ فَقَدْ غَزَا ).

واتە: هەرکەسێك یەکێك ئامادە بکات بۆ غەزا کردن لە پێناو خوای گەورەدا ئەوا وەکو ئەوە وایە کە خۆیشی غەزای کردبێت، وە هەرکەسێك سەرپەرشتی کەسوکاری ئەو کەسە بکات کە چووە بۆ غەزا بە چاکە ئەویش وەك ئەوە وایە کە خۆیشی غەزای کردبێت.

٣٦- (مَنْ رَاحَ رَوْحَةً في سَبيلِ اللهِ كانَ لَهُ بِمِثلِ مَا أصَابَهُ مِنَ الغُبارِ مِسْكاً يَومَ القِيامَةِ)

واتە: هەرکەسێك دەرچێت لە پێناو خوا بۆ جیهاد کردن ئەوا بە ئەندازەی ئەو تۆزەی چووە بەسەریدا دەبێت بە میسك بۆی لەڕۆژی قیامەتدا.

٣٧- (مَا يَجِدُ الشَّهِيدُ مِنْ مَسَّ الْقَتْلِ إلَّا كَما يَجِدُ أحَدُكُمْ مِنْ مَسِّ القَرْصَةِ ) .

واتە: شەهید هەست بە ئازاری کوشتن ناکات مەگەر وەکو ئەوەی چۆن یەکێك لە ئێوە هەست بە ئازاری قرونچکێك و کێچ پێوەدان بکات.

٣٨- (صَلاحُ أَوَّلُ هَذِهِ الأُمَّةُ بِالزُّهْدِ وَاليَقِينِ، وَيَهْلِكُ آخِرُهَا بِالبُخْلِ وَالأَمَلِ) .

واتە: چاکی سەرەتای ئەم ئوممەتە بە زوهدو دڵنیاییە، وە کۆتایی ئەم ئوممەتە لەناو دەچێت بە چروکی و هیوا درێژی.

٣٩- (بَشِّرْ هَذِهِ الأُمَّةِ بِالسَّناءِ وَالدِّينِ وَالرِّفْعَةِ وَالنَّصْرِ وَالتَّمْكِينِ فِي الأَرْضِ ) .

واتە: موژدە بەم ئوممەتە بدە بە پلەو پایە بەرزی و دین و بڵندی و سەرکەوتن و جێگیر بوون و دەسەڵات لەسەر زەوی.

٤٠- (مَثَلُ العَالِمِ الذي يُعَلِّمُ النَّاسَ الخَيرَ وَيَنْسَى نَفْسَهُ كَمَثَلِ السِّراجِ يُضِيءُ لِلنَّاسِ وَيُحْرِقُ نَفْسَهُ) .

واتە: نمونەی ئەو زانایەی کە خەڵکی فێر چاکە دەکات و خۆی لە بیر دەکات وەکو ئەو مۆمە وایە کە تاریکی بۆ خەڵك ڕووناك دەکاتەوەو خۆی دەسوتێت.

٤١- (مَثَلُ المُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللهِ –وَاللهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِهِ– كَمَثَلِ الصَّائِمِ القَائِمِ الخَاشِعِ الرَّاكِعِ السَّاجِدِ) .

واتە: نمونەی کەسێك کە جیهاد دەکات لە پێناو خوای گەورە –کە خوای گەورە خۆی زاناترە بە نیەت کە کێ لەبەر خاتری خوای گەورە جیهاد دەکات–

وەکو نمونەی کەسێکە کە بەشەو شەو نوێژ بکات ولـە سـوجدەو ڕکـوع دا بێـت و بەڕۆژ بەڕۆژوو بێت.

٤٢- (مَفاتِيحُ الغَيبِ خَمْسٌ لا يَعْلَمُهَا إلَّا اللهُ تَعَالى: لا يَعْلَمُ أحدٌ ما يكونُ فِي غَدٍ إلَّا اللهُ تَعَالى، وَلا يَعْلَـمُ أحَـدٌ مَـا يَكـونُ فِي الأرْحـامِ إلَّا اللهُ تعـالى، وَلا يَعْلَـمُ مَـتى تَقُـومُ السَّاعَةُ إلَّا اللهُ تَعَالى، وَلا تَدْرِي نَفْسٌ بِأيِّ أرْضٍ تَمُوتُ إلَّا اللهُ تَعَالى، وَلا يَدرِي أحَدٌ مَتى يَجِيءُ المَطَرُ إلَّا اللهُ تَعَالى) .

واته: کلیلەکانی پەنهان و غەیب پێنج شـتن تـەنها خـوای گـەورە نـەبێت کـەس نایزانێت: هیچ کەس نازانێت سبەینێ چی روو دەدات تـەنها خـوای گـەورە نـەبێت، وە هیچ کەس نازانێت چی لەڕەحمی ئافرەتدا هەیە تەنها خوای گەورە نـەبێت، وە هیچ کەس نازانێت کەی قیامەت هەڵدەسێت جگە لە خوای گـەورە، وە هـیچ کـەس نازانێت کە لە کوێ دەمرێت جگە لـە خـوای گـەورە، وە هـیچ کـەس نازانێـت کـەی باران دێت جگە لە خوای گەورە.

٤٣- (مَنْ أَذَّنَ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ سَنَةً وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، وَكُتِبَ لَهُ بِتَأْذِينِهِ فِي كُلِّ يَوْمٍ سِتُّونَ حَسَنَةً، وَ بإِقَامَته ثَلَاثُونَ حَسَنَةً) .

واتە: هەرکەسێك دوانزە ساڵ بانگ بدات بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت، وە هەموو ڕۆژێك بە بانگ دانەکەی شەست ئەجری بۆ دەنوسرێت وە بە قامەت کردنەکەی سی خێری بۆ دەنوسرێت.

٤٤- (مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَى اللَّهَ، وَمَنْ يُطِعِ الْأَمِيرَ فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ يَعْصِ الْأَمِيرَ فَقَدْ عَصَانِي).

واتە: هەرکەسێك گوێڕایەڵی من بکات ئەوا گوێڕایەڵی خوای گەورەی کردووە، وە هەرکەسێك سەرپێچی من بکات ئەوا سەرپێچی خوای گەورەی کردووە، وە هەرکەسێك گوێڕایەڵی ئەمیرەکەی بکات ئەوا گوێڕایەڵی منی کردووە، وە هەرکەسێك سەرپێچی ئەمیرەکەی بکات ئەوا سەرپێچی منی کردووە.

٤٥- (مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَقَدْ غَزَا، وَمَنْ خَلَفَ غَازِيًا فِي أَهْلِهِ بِخَيرٍ فَقَدْ غَزَا) .

واتە: هەرکەسێك موجاهیدێك ئامادە بکات و پێداویستیەکانی بۆ دابین بکات لە پێناو خوای گەورە ئەوا وەك ئەوە وایە خۆی غەزای کردبێت، وە هەرکەسێك سەرپەرشتیاری کەس و کاری موجاهیدێك بکات بە چاکە ئەوە بەدڵنییای وەکو ئەوە وایە کە خۆی غەزای کردبێت.

٤٦- (مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْكَهْفِ عُصِمَ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ) .

واتە: هەرکەسێك دە ئایەت لەسەرەتای سورەتی کەهف لەبەر بکات ئەوا دەپارێزرێت لە فیتنەی دەجال.

٤٧- (مَنْ خَافَ أَدْلَجَ، وَمَنْ أَدْلَجَ بَلَغَ الْمَنْزِلَ، أَلَا إِنَّ سِلْعَةَ اللَّهِ غَالِيَةٌ، أَلَا إِنَّ سِلْعَةَ اللَّهِ الْجَنَّةُ).

واتە: هەرکەسێك لەخوا بترسێت سەرەتای شەو بەڕێ دەکەوێتو هەموو خێرو چاکەیەك دەکات، وە هەرکەسێکیش سەرەتای شەو بەڕێ بکەوێت ئەوا دەگاتە ماڵەکە (بەهەشت) وە ئاگاداربن کە کاڵای خوای گەورە بەنرخە وە ئاگاداربن کاڵای خوای گەورە بەهەشتە.

٤٨- (مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمَانِ ) .

واتە: هەرکەسێك لە ئێوە خراپەیەکی بینی ئەوا با بەدەستی بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی ئەوا با بەزمانی بیگۆڕێت، وە ئەگەر نەیتوانی ئەوا با بە دڵی بیگۆڕێت، کە ئەمەیان لاوازترین باوەڕە.

٤٩- (مَنْ سَبَّ أصْحابِي فَعَلَيهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالملائِكَةِ وَالنَّاسِ أجْمَعِينَ ) .

واتە: هەرکەسێك جنێو بە هاوەڵەکانم بدات ئەوە نەفرەتی خواو و فریشتەکان و تێکڕای خەڵکی لێ بێت.

٥٠- (مَنْ سَرَّهُ أنْ يَجِدَ حَلاوَةَ الإيمانِ فَلْيُحِبَّ المَرْءَ لا يُحِبُّهُ إلَّا لِلَّهِ) .

واتە: هەرکەسێك پێی خۆشە تامی شیرینی باوەڕ بکات ئەوا با کەسێکی خۆش ویست تەنها بۆ خوا خۆشی بوێت.

٥١- (مَنْ عَادَى عَمَّارًا عَادَاهُ اللَّهُ، وَمَنْ أَبْغَضَ عَمَّارًا أَبْغَضَهُ اللَّهُ ) .

واتە: هەرکەسێك دژایەتی عەممار (خوای لێ رازی بێت) بکات ئەوا خوای گەورە دژایەتی دەکات، وە هەرکەسێك ڕقی لە عەممار(خوای لێ رازی بێت) بێت ئەوا خوای گەورە ڕقی لێی دەبێت.

٥٢- (مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ: وَانَا أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، غَفَرَ اللَّهُ لَهُ ما تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ) .

واتە: هەرکەسێك کە گوێی لە بانگدەر بوو بڵێت: وَأنَا أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا ئەوا خوای گەورە لە تاوانەکانی پێشووی خۆش دەبێت.

٥٣- (مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، في يَومٍ مِائَةَ مَرَّةٍ حُطَّتْ خَطاياهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ البَحْرِ) .

واتە: هەرکەسێك لە ڕۆژێکدا سەد جار بڵێت: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ ئەوا تاوانەکانی هەڵدەوەرێت و پاك دەبێتەوە ئەگەر وەکو کەفی دەریا زۆر بێت.

٥٤- (مَنْ قَامَ بِعَشْرِ آيَاتٍ لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِينَ، وَمَنْ قَامَ بِمِائَةِ آيَةٍ كُتِبَ مِنَ الْقَانِتِينَ، وَمَنْ قَامَ بِأَلْفِ آيَةٍ كُتِبَ من المُقَنْطِرِينَ) .

واتە: هەر کەسێك لە شەونوێژدا دە ئایەت بخوێنێت ئەوا لە بێ ئاگایان ناونوس ناکرێت، وە هەرکەسێك لەشەونوێژدا سەد ئایەت بخوێنێ ئەوا لە خواپەرستان و گوێڕایەڵان ناونوس دەکرێت، وە هەرکەسێك لەشەونوێژدا هەزار ئایەت بخوێنێت ئەوا قینتارێك پاداشتی بۆ دەنوسرێت واتە: پاداشتێکی یەکجار زۆر.

٥٥- (مَنْ قَتَلَ وَزَغَةً فِي أَوَّلِ ضَرْبَةٍ كُتِبَ لَهُ مِائةُ حَسَنَةٍ، وَمَنْ قَتَلَهَا فِي الضَّرْبَةِ الثَّانِيةِ فَلَهُ كَذا وَكَذا حَسَنَةً، وَإِنْ قَتَلَهَا فِي الضَّرْبَةِ الثَّالِثَةِ فَلَهُ كَذا وَكَذا حَسَنَةً) .

واتە: هەرکەسێك بەیەکجار مارمێلکێك بکوژێت ئەوا سەد چاکەی بۆ دەنوسرێت، وە هەرکەسێك بە دووەم جار بیکوژێت ئەوا ئەوەندەو ئەوەندە چاکەی بۆ دەنوسرێت، وە ئەگەر بە سێیەم جار بیکوژێت ئەوا ئەوەندەو ئەوەندە خێری بۆ دەنوسرێت.

٥٦- (لَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثِ لَيَالٍ، يَلْتَقِيَانِ، فَيُعْرِضُ هذَا، وَيُعْرِضُ هذَا، وَخَيْرُهُمَا الَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلَامِ) .

واتە: حەڵاڵ نیە بۆ هیچ موسڵمانێك كە قسە لەگەڵ براكەیدا نەكات لە سێ شەو زیاتر، بگەن بەیەكتری ئەم پشت لەو بكات و ئەو پشت لەم بكات، وە باشترینیان ئەو كەسەیانە كە دەست پێشخەری بكات لەسەلام كردن.

٥٧- (لا تُصَلُّوا إلى قَبْرٍ، وَلا تُصَلُّوا على قَبْرٍ) .

واتە: نوێژ مەكەن ڕووەو قەبر، وە نوێژ مەكەن لەسەر قەبر.

٥٨- (لَا تَسُبُّوا الدِّيكَ، فَإِنَّهُ يُوقِظُ لِلصَّلاةِ ) .

واتە: جنێو بەكەڵەشێر مەدەن، چونكە بەڕاستی ئەو خەڵك بەخەبەر دێنێ بۆ نوێژ كردن.

٥٩- (لا تَزَالُ عِصَابَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ على الحَقِّ، لا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى تَأْتِيَهُمُ السَّاعَةُ وَهُمْ على ذلِكَ) .

واتە: بەردەوام كۆمەڵێك لە ئوممەتەكەم كوشتار دەكەن لەسەر حەق ئەوانەی پێچەوانەیان بێت زیانیان پێ ناگەیەنێت تا ڕۆژی قیامەت دێت ئەوان لەسەر ئەو شتەن.

٦٠- (لا تَحْلِفُوا بِآبائِكُمْ، مَنْ حَلَفَ بِاللهِ فَلْيَصْدُقْ، وَمَنْ حُلِفَ لَهُ بِاللهِ فَلْيَرْضَ، وَمَنْ لَمْ يَرْضَ بِاللهِ فَلَيسَ مِنَ اللهِ ) .

واتە: سوێند مەخۆن بە باوكو باپیرانان، هەركەسێك سوێندی خوارد بەخوای گەورە با ڕاست بكات، وە هەركەسێك سوێندی بە خوا بۆ خورا باڕازی بێت، وە هەركەسێك بە خودا ڕازی نەبێت ئەوا خوای گەورە دەست بەرداری دەبێت.

# قۆناغی حەوتەم

١- (لَا يَدْخُلُ النَّارَ أحَدٌ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ ) .

واتە: هەرکەسێك بە ئەندازەی تۆوی خەردەلەیەك ئیمان لەدڵیدا بێت ناچێتە ئاگری دۆزەخەوە.

٢- (اثْنانِ يُعَجِّلُهُمَا اللهُ في الدُّنْيَا: البَغِي وَعُقوقُ الوَالِدَينِ ) .

واتە: دوو تاوان هەیە خوای گەورە سزاکەیان پێش دەخات لە دونیادا: زوڵم و ستەم کردن و ئازاردانی دایك و باوك.

٣- (لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ لَا يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَائِقَهُ) .

واتە: هەرکەسێك دراوسێکەی ئەمین نەبێت لە خراپەکانی ئەوا ناچێتە بەهەشتەوە.

٤- (أَحَبُّ الْبِلَادِ إِلَى اللَّهِ مَسَاجِدُهَا، وَأَبْغَضُ الْبِلَادِ إِلَى اللهِ أسْواقُهَا) .

واتە: خۆشەویستترین شوێن لای خوای گەورە مزگەوتەکانە، وە ڕق لێ بووترین شوێن لای خوای گەورە بازاڕەکانە.

٥- (أَحَبُّ الْأَسْمَاءِ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ: عَبْدُ اللَّهِ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ) .

واتە: خۆشەویسترین ناو لای خوای گەورە عَبْدُ اللَّهِ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ ە.

٦- (إن أحْسَنَ النَّاسِ قِرَاءةً الذي إذا رَأيْتَهُ يَقْرَأُ حَسِبْتَهُ يَخْشَى اللهَ ) .

واتە: باشترین قورئان خوێن ئەو کەسەیە کە دەیبینیت قورئان دەخوێنێت هەست دەکەیت کە لەخوا دەترسێت.

٧- (إذا أرَادَ اللهُ بِأهْلِ بَيْتٍ خَيراً أدْخَلَ عَلَيهِمْ الرِّفْقَ) .

واتە: ئەگەر خوای گەورە خێرو چاکەی خانەوادەیەکی بوێت ئەوا نەرم و نیانی دەخاتە نێوانیانەوە.

٨- (أَتِمُّوا الصَّفَّ الْمُقَدَّمَ، ثُمَّ الَّذِي يَلِيهِ، فَمَا كَانَ مِنْ نَقْصٍ فَلْيَكُنْ فِي الصَّفّ الْمُؤَخَّرِ) .

واتە: ڕیزی پێشەوەی نوێژی بە کۆمەڵ تەواو بکەن، پاشان ڕیزی دواتر، ئەگەر ناتەواوی هەبوو پڕ نەبوەوە ئەوا با بکەوێتە ڕیزی کۆتاییەوە.

٩- (إذا جَاءَ أحَدُكُمْ الى الصَّلاةِ فَلْيَمْشِ على هَيْئَتِهِ، فَلْيُصَلِّ مَا أدْرَكَ، وَلْيَقْضِ مَا سَبَقَهُ) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە هات بۆ نوێژ با بەهێمنی و ئارامی یەوە بێت، ئەوەندەی فریا کەوت با لەگەڵ ئیمام بیکات، ئەوەیشی فریا نەکەوت با خۆی بە تەنها بیکات.

١٠- (إذا حَلَمَ أحَدُكُمْ فَلا يُحَدِّثِ النَّاسَ بِتَلَعُّبِ الشَّيْطَانِ فِي المَنَامِ) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە خەوی خراپی بینی ئەوا با بۆخۆی نەیگێڕێتەوە چونکە شەیتان لە خەودا یاری پێ کردووە.

١١- (إذا دخَلَ أحَدُكُمْ المَسْجِدَ فَلا يَجْلِسَ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَينِ ) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە هاتە ناو مزگەوت با دانەنیشێت تا دوو ڕکات نوێژ دەکات.

١٢- (إِذَا سَمِعْتَ جِيرَانَكَ يَقُولُونَ: قَدْ أَحْسَنْتَ فَقَدْ أَحْسَنْتَ، وَإِذَا سَمِعْتَهُمْ يَقُولُونَ: قَدْ أَسَأْتَ فَقَدْ أَسَأْت) .

واتە: ئەگەر بیستت دراوسێکانت وتیان: چاکت کرد ئەوا چاکت کردووە، وە ئەگەر بیستت ووتیان: خراپت کرد ئەوا بە دڵنیایی خراپت کردووە.

١٣- (إذا شَرِبْتُمُ اللَّبَنَ فَتَمَضْمَضُوا مِنْهُ، فَإِنَّ لَهُ دَسَماً) .

واتە: ئەگەر شیرتان خوارد ئاو لە دەمتان وەربدەن، چونکە بەڕاستی چەوری هەیە.

١٤- (إذا صَلَّى أحَدُكُمْ فَلْيُصَلِّ إلى سُتْرَةٍ وَلْيَدْنُ مِنْ سُتْرَتِهِ، لا يَقْطَعُ الشَّيْطَانُ عَلَيهِ صَلَاتَهُ).

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد با نوێژ بکات ڕووەو سوترەیەك وە با نزیك بێتەوە لە سوترەکەی، با شەیتان نوێژەکەی پێ نەبڕێت.

١٥- (إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ: أَنْصِتْ، فَقَدْ لَغَوتَ) .

واتە: ئەگەر لە نوێژی هەینیدا ئیمام وتاری دەخوێن بە هاوڕێکەت بڵێیت بێ دەنگ بە ئەوا بە دڵنیاییەوە لەغوت کردووە.

١٦- (إِذَا مَاتَ الْإِنْسَانُ إنْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثٍ: صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، وعِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ) .

واتە: ئەگەر مرۆڤ بمرێت ئەوا کردەوەکانی دەبچڕێت تەنها لە سێ ڕێگەوە نەبێت: صەدەقەو خێرێکی بەردەوام و نەبڕاوە، وە زانیارییەك کە خەڵکی لە پاش خۆی سودی لێ ببینن، یاخود منداڵێکی صالح لە پاش خۆی دوعای خێری بۆ بکات.

١٧- (اسْتَقِيمُوا وَلَنْ تُحْصُوا، وَاعْلَمُوا أَنَّ خَيْرَ أَعْمَالِكُمُ الصَّلَاةُ، وَلَا يُحَافِظُ عَلَى الْوُضُوءِ إِلَّا مُؤْمِنٌ) .

واتە: دامەزراو بن وەنایش توانن لەهەموو شتێکدا بەردەوام دامەزراو بن لەبەر قورسی، وە بزانن باشترین کردەوەکانتان نوێژە، وە هیچ کەسێك پارێزگاری لە دەست نوێژ ناکات بەردەوام دەست نوێژی هەبێت تەنها باوەڕدار نەبێت.

١٨- (أفْضَلُ الأعْمالِ أنْ تُدْخِلَ على أخِيكَ المؤمِنِ سُروراً، أوْ تَقْضِي عَنْهُ دَيناً، أوْ تُطْعِمَهُ خُبْزاً) .

واتە: باشترین کردەوە ئەوەیە کە خۆشییەك بخەیتە دڵی برا باوەڕدارەکەتەوە، یاخود قەرزێکی بۆ بدەیتەوە، یاخود خواردنی بدەیتێ.

١٩- (اقْرَءُوا سُورَةَ البَقَرَةِ فِي بُيُوتِكِمْ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لا يَدْخُلُ بَيْتاً يُقْرَأُ فِيهِ سُورَةَ البَقَرَةِ) .

واتە: سورەتی بەقەرە لە ماڵەکانتاندا بخوێنن، چونکە بەراستی شەیتان ناچێتە ماڵێکەوە کە سورەتی بەقەرەی تیادا خوێندرابێت.

٢٠- (إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ حَتَّى النَّمْلَةَ فِي جُحْرِهَا وَحَتَّى الْحُوتَ لَيُصَلُّونَ عَلَى مُعَلِّمِ النَّاسِ الْخَيْرَ) .

واتە: خوای گەورەو فریشتەکان تەنانەت مێرولە لە کونی خۆیدا وە تەنانەت نەهەنگ لە دەریادا دوعای خێر بۆ فێرکارو مامۆستای خێرو چاکە دەکەن.

٢١- (إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَبْسُطُ يَدَهُ بِاللَّيْلِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ النَّهَارِ، وَيَبْسُطُ يَدَهُ بِالنَّهَارِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ اللَّيْلِ، حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا) .

واتە: خوای گەورە بەشەو دەستی دەکاتەوە تا خۆش بێت لەو کەسانەی بەڕۆژ تاوانیان کردووە، وە بەڕۆژ دەستی دەکاتەوە تا خۆش بێت لەو کەسانەی کە بەشەو تاوانیان کردووە، تا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت.

٢٢- (إِنَّ اللهَ تَعَالَى يُبْغِضُ كُلَّ عَالِمٍ بِالدُّنْيا جَاهِلٍ بِالآخِرَةِ) .

واتە: خوای گەورە ڕقی لە کەسێکە کە زانا بێت بە دونیاو نەزان بێت بە قیامەت.

٢٣- (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعُطَاسَ، وَيَكْرَهُ التَّثَاؤُبَ، فَإِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَحَمِدَ اللَّهَ كَانَ حَقّاً عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ سَمِعَهُ أَنْ يُقُولَ لَهُ يَرْحَمُكَ اللهُ، وَأَمَّا التَّثَاؤُبُ فَإِنَّهُ مِنَ الشَّيْطَانِ) .

واتە: خوای گەورە پـژمینی خـۆش دەوێـت، و باوێشـکی پـێ ناخۆشـە، ئەگـەر یەکێك لە ئێوە پژمی و وتی: الحمد لله ئەوا حەقـە لەسـەر هـەموو موسـڵمانێك پێـی بڵێ: (يَرْحَمُكَ اللهُ) خوا ڕەحمت لێ بکات بەڵام باوێشك لە شەیتانەوەیە.

٢٤- (إِنَّ اللهَ يَقُولُ: يَا ابْنَ آدَمَ اكْفِنِي أَوَّلَ النَّهارِ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ أَكْفِكَ بِهِنَّ آخِرَ يَوْمِكَ) .

واتە: خوای گەورە دەفەرمێت: ئەی ئادەمیزاد سەرەتای ڕۆژ چوار ڕکات نوێـژم بۆ بکە (چێشتەنگاو) کۆتایی ڕۆژت لەسەر من و بەستە بۆ کۆتایی ڕۆژ.

٢٥- (إِنَّ سُورَةً مِنْ كِتابِ اللهِ مَا هِيَ إِلَّا ثَلاثُونَ آيَةً شَفَعَتْ لِرَجُلٍ فَأَخْرَجَتْهُ مِنَ النَّارِ وَأَدْخَلَتْهُ الجَنَّةَ) .

واتە: بەڕاستی سورەتێك لە قورئاندا هەیە تـەنها سـێ ئایەتە(سـورەتی مولـك) شـەفاعەت و تکـای کـرد بـۆ پیاوێـك کـە لـە ئـاگری دۆزەخ دەری کـردو کردیـە بەهەشتەوە.

٢٦-  (إنَّ عِلْماً لا يُنْتَفَعُ بِهِ كَكَنْزٍ لا يُنْفَقُ مِنْهُ فِي سَبيلِ اللهِ) .

واتە: بەڕاستی زانیارییەك كە سودی لێ نەبینرێت وەكو خشڵێك وایە كە لە پێناو خوای گەورەدا لێی نەبەخشرێت.

٢٧-  (إنَّ الدُّنْيَا مَلْعُونَةٌ، مَلْعُونٌ مَا فِيهَا إلَّا ذِكْرَ اللهِ وَمَا وَالاهُ، وَعَالِمَاً أوْ مُتَعَلِّمَاً).

واتە: بەراستی دونیا دورە لە رەحمەتی خوای گەورەوە، وە ئەوەیشی تێیدایە تەنها زیكری خواو هاوشێوەی نەبێت، وە زاناو فێرخواز نەبێت.

٢٨-   (إنَّمَا جَزَاءُ السَّلَفِ الحَمْدُ وَالوَفَاءُ) .

واتە: تەنها پاداشتی قەرز سوپاس كردن و گەڕاندنەوەیەتی.

٢٩-  (أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِكُمْ مِنْ شَرِّكُمْ؟ (خَيْرُكُمْ مَنْ يُرجَى خَيْرُهُ وَيُؤْمَنُ شَرُّهُ، وَشَرُّكُمْ مَنْ لَا يُرْجَى خَيْرُهُ وَلا يُؤْمَنُ شَرُّهُ) .

واتە: ئایا ئاگادارتان بكەمەوە لە باشترین و خراپترینتان؟ باشترینتان ئەو كەسەیە كە ئومێدی خێرو چاكەی لێ بكرێت و ئەمین بن لە شەڕو خراپەی، وە خراپترینتان ئەو كەسەیە كە ئومێدی خێرو چاكەی لێ نەكرێت و ئەمین نەبن لەشەڕو خراپەی.

٣٠- (أَلَا أَدُلُكُمْ على ما يُكَفِّرُ اللهُ بِهِ مِنَ الخَطَايَا وَيَزِيدُ في الحَسَناتِ؟ إِسْبَاغُ الوُضُوءِ على المكْرُوهاتِ، وَكَثْرَةُ الخُطَى إِلَى الْمَسَاجِدِ، وَانْتِظَارُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصَّلَاةِ، فَذَلِكُمُ الرِّباطُ فَذلِكُمُ الرِّباطُ فَذلِكُمُ الرِّباطُ) .

واتە: ئایا ڕێنمونیتان نەکەم لەسەر ئەو شتەی کە بەهۆیەوە خوای گەورە تاوانەکان دەسڕێتەوە وە چاکەکان زیاد دەکات؟ دەست نوێژ گرتنێکی تەواو لە کاتی ناخۆشیدا (ئاوی سارد لە زستاندا)، وە زۆری هەنگاو نان بەرەو مزگەوت، وە چاوەڕوان کردنی نوێژ لە دوای نوێژ، ئا ئەمەیە ریبات ئا ئەمەیە ریبات ئا ئەمەیە ریبات (پاسەوانی گرتن لەبەرامبەر دوژمندا).

٣١- (الْإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ شُعْبَةً فَأَفْضَلُهَا: قَوْلُ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَدْنَاهَا: إِمَاطَةُ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَالحياةُ شُعْبَةٌ مِنَ الإيمانِ).

واتە: ئیمان حەفتاو سێ بۆ حەفتاو نۆ لقە لە هەمووی باشتر وتنی: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ یە وە لە هەمووی نزمتر لابردنی ئازارێکە لەڕێگای خەڵکی، وە شەرم و ئابڕوویش لقێکە لە ئیمان.

٣٢- (بَشِّرِ الْمَشَّائِينَ فِي الظُّلَمِ إِلَى الْمَسَاجِدِ بِالنُّورِ التَّامِّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) .

واتە: موژدە بدە بەو کەسانەی کە لەتاریکی شەودا دەچن بۆ مزگەوت بە ڕوناکی تەواو لە ڕۆژی قیامەتدا.

٣٣- (بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ وَجَدَ غُصْنَ شَوْكٍ عَلَى الطَّرِيقِ فَأَخَّرَهُ فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ) .

واته: جارێك پیاوێك بەڕێگایەكدا دەڕۆیشت لقە دارێكی (دڕكێكی) لەسەر ڕێگایەكدا بینی ئەویش لای برد خوای گەورە سوپاسی كردو لێی خۆش بوو.

٣٤- (الْبُزاقُ فِي الْمَسْجِدِ سَيِّئَةٌ وَدَفْنُهُ حَسَنَةٌ ) .

واته: تف كردن لە مزگەوت تاوانەو شاردنەوەی خێرو چاكەیە.

٣٥- (بُعِثْتُ بَينَ يَدَيَ السَّاعَةِ بِالسَّيْفِ حَتَّى يُعْبَدَ اللَّهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَجُعِلَ رِزْقِي تَحْتَ ظِلِّ رُمْحِي، وَجُعِلَ الذِّلَّةُ وَالصَّغَارُ عَلَى مَنْ خَالَفَ أَمْرِي، وَمَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ).

واته: قیامەت لە پێشمەوەیەو نێردراوم بە شمشێر تا بەتاك و تەنها خوا بپەرسترێت و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدرێت، وە رزق و ڕۆزیم خراوەتە ژێر سێبەری رمەكەم، وە زەلیلی و ڕسوایی و سەرشۆڕی بۆ هەموو كەسێكە كە پێچەوانەی فەرمانم بكات، وە هەركەسێك خۆی بچوێنێت بە هەر كۆمەڵێك ئەوا لەوانە.

٣٦- (لا يَلِجُ النَّارَ رَجُلٌ بَكَى مِنْ خَشْيَةِ اللهِ حَتَّى يَعُودَ اللَّبَنُ فِي الضَّرْعِ ، وَلاَ يَجْتَمِعُ غُبَارٌ فِي سبيلِ اللهِ وَدُخَانُ جَهَنَّمَ فِي مِنْخَرَي مُسْلِمٍ ) .

واتە: هەرکەسێك لە ترسی خوای گەورە بگری ئەوا ناچێتە دۆزەخەوە هەتاوەکو شیر نەگەڕێتەوە ناو گوان، وە تەپ و تۆزی جیهاد کردن لە پێناوی خوای گەورەو دوکەڵی ئاگری دۆزەخ لەناو لوتی موسڵماندا کۆنابێتەوە.

٣٧- (أَفْضَلُ الشُّهَداءِ الذينَ يُقاتِلُونَ فِي الصَّفِّ الأَوَّلِ فَلا يَلْفِتُونَ وُجُوهَهُمْ حَتَّى يُقْتَلُوا) .

واتە: باشترین شەهیدەکان ئەوانەن کەوا لە پێناو خوای گەورەدا کوشتار دەکەن لەڕیزی یەکەمداو ڕوویان وەرناگێڕن لە دوژمن تا دەکوژرێن.

٣٨- (الْحَلَالُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ، وَالْحَرَامُ مَا حَرَّمَ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ، وَمَا سَكَتَ عَنْهُ فَهُوَ مِمَّا عَفَا عَنْهُ) .

واتە: حەڵاڵ ئەوەیە کە خوای گەورە حەڵاڵی کردووە لە قورئانەکەیدا، وە حەرامیش ئەوەیە کە خوای گەورە حەرامی کردووە لە قورئانەکەیدا، وە ئەوەی لێی بێدەنگ بووە ئەوا بوراوە لێی.

٣٩- (الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنَ اللَّهِ، وَالْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ شَيئاً يَكْرَهُهُ فَلْيَنْفُثْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلاثاً، وَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّهَا فَإِنَّهَا لا تَضُرُّهُ ) .

واتە: خەوی باش لە خواوەیە، وە خەوی خراپ لە شەیتانەوەیە، ئەگەر یەکێك لە ئێوە خەونێکی ناخۆشی بینی ئەوا با سێ جار تف بکات بە لای چەپیداو پەنا

بگرێت بە خوای گەورە لە شەڕو خراپەی شەیتان ئەو کاتە بـە دڵنیـایی زیـانی پـێ ناگەیەنێت.

٤٠- (صَلاةُ الضُّحَى صَلاةُ الأَوَّابِينَ ) .

واتە: نوێژی چێشتەنگاو نوێژی گەڕاوەکانە بۆ لای خوا.

٤١- (طَيِّبُوا أفْواهَكُمْ بِالسِّواكِ، فَإِنَّهَا طُرُقُ الْقُرْآنِ ) .

واتە: دەمتان پاك بکەنەوە بە سیواك، چونکە ڕێگای قورئانە.

٤٢- (عَلى كُلِّ رَجُلٍ مُسْلِمٍ فِي كُلِّ سَبْعَةِ أَيَّامٍ غُسْلُ يَومٍ: وَهُوَ يَومُ الجُمُعَةِ ) .

واتە: لەسەر هەموو پیاوێکی موسڵمان پێویستە لە حەوت ڕۆژ جارێکـدا غوسـڵ دەربکات ئەویش کە ڕۆژی جومعەیە.

٤٣- (الْقُرْآنُ شَافِعٌ مُشَفَّعٌ ومَاحِلٌ مُصَدَّقٌ، فَمَنْ جَعَلَهُ إمَامَهُ قَادَهُ إِلَى الجَنَّةِ، وَمَنْ جَعَلَهُ خَلْفَهُ سَاقَهُ إِلَى النَّارِ) .

واتە: قورئـانی پـیرۆز تکاکـارەو تکـا وەرگـیراوە وە هـەوڵ دەدات و بـەرگری دەکات و بەڕاست دانراوە هەرکەسێك بیکات بە پێشەوای خـۆی ئـەوا دەیگەیـەنێت بە بەهەشت، وە هەرکەسێك بیخاتە دواوەو پشت گـوێی بخـات ئـەوا بـەرەو ئـاگری دۆزەخی دەبات.

٤٤- (كَفَّارَةُ الْمَجْلِسِ أنْ يَقُولَ العَبْدُ: سُبْحَانَكَ اللهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ) .

واتە: دوعای سڕینەوەی تاوانی دانیشتن ئەوەیە کە بەندە بڵێت: سُبْحَانَكَ اللهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

٤٥- (كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ وَإِنَّ مِنْ الْمَعْرُوفِ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ وَأَنْ تُفْرِغَ مِنْ دَلْوِكَ فِي إِنَاءِ جَارِكَ) .

واتە: هەموو چاکەیەك خێرە، وە یەکێك لە چاکەکان ئەوەیە کە بگەیت بە براکەت ڕووت کراوەو خۆش بێت بەرامبەری، وە لە ئاوی دۆلکەکەت بخەیتە ناو قاپی دراوسێکەت.

٤٦- (لِلْمُؤْمِنِ عَلَى الْمُؤْمِنِ سِتُّ خِصَالٍ: يَعُودُهُ إِذَا مَرِضَ، وَيَشْهَدُهُ إِذَا مَاتَ، وَيُجِيبُهُ إِذَا دَعَاهُ، وَيُسَلِّمُ عَلَيْهِ إِذَا لَقِيَهُ، وَيُشَمِّتُهُ إِذَا عَطَسَ، وَيَنْصَحُ لَهُ إِذَا غَابَ أَوْ شَهِدَ، النُصْحُ: الإِخْلاصُ) .

واتە: مافی باوەڕدار بەسەر باوەڕدارەوە شەش شتە: کە نەخۆش کەوت سەردانی بکات، وە کەمرد دوای جەنازەکەی بکەوێت، وە کە دەعوەتی کرد بەدەم دەعوەتەکەیەوە بڕوات، وە کە پێی گەیشت سەلامی لێ بکات، وە کە پژمی ووتی:

الحمد لله بڵێ يرحمك الله، وە ئامۆژگاری بكات لـە كـاتی ئامـادە بـوون و نـا ئامـادە بووندا، وە ئامۆژگاريش بريتی يە لە دڵسۆزی.

٤٧- (لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي صَلاَةِ الْعِشَاءِ وَصَلاَةِ الْفَجْرِ لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا) .

واتە: ئەگەر خەڵكی بيانزانيايە كە نوێژی عيشاو بەيانی بە جەماعـەت چـەندێ خێری تێدايە ئەوا بۆی دەهاتن ئەگەر بە گاگۆڵكێيش بوايە (لەسەر ئەژنۆ).

٤٨- (لَيْسَ بَيْنَ الْعَبْدِ وَالشِّرْكِ إِلَّا تَرْكُ الصَّلَاةِ، فَإِذَا تَرَكَهَا فَقَدْ أَشْرَكَ ) .

واتە: هيچ شتێك لە نێوان مرۆڤ و شەريك دانان نيە تـەنها واز هێنـان نـەبێت لـە نوێژ، ئەگەر كەسێك واز لە نوێژ بێنێت ئەوا بەدڵنيايی شەريكی بۆ خوا داناوە.

٤٩- (الَّذِي يُصَلِّي وَلَا يُتِمُّ رُكُوعَهُ وَلَا سُجُودَهُ مَثَلُ الْجَائِعِ الَّذِي لَا يَأْكُلُ إِلَّا التَّمْرَةَ وَالتَّمْرَتَيْنِ, لَا تُغْنِيَانِ عَنْهُ شَيْئًا) .

واتە: ئەو كەسەی كەوا ركوعەكەی تەواو ناكات و لـە كڕنوشـدا دەنـوك دەدات وەكو كەسێكی برسـی وايـە دەنكێـك خورمـاو دوو دەنـك دەخـوات كـە هـيچ تێـری ناكات و سودی پێ ناگەيەنێت.

٥٠- (لَيْسَ الصِّيَامُ مِنَ الْأَكْلِ وَالشُّرْبِ، إِنَّمَا الصِّيَامُ مِنَ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ، فَإِنْ سَابَّكَ أَحَدٌ أَوْ جَهِلَ عَلَيْكَ فَقُلْ إِنِّي صَائِمٌ إِنِّي صَائِمٌ) .

واتە: بەڕۆژوو بوون خۆ گرتنەوە نیە لە خواردن و خواردنەوە، بەڵکو خۆ گرتنەوەیە لە قسەی پڕو پوچ و ناشرین، وە ئەگەر کەسێك جنێوی پێ دایت یاخود نەفامی بەرامبەرت کرد ئەوا پێی بڵێ من بەڕۆژووم من بەڕۆژووم.

٥١- (الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَهُوَ مَاهِرٌ بِهِ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ وَالَّذِي يَقْرَؤُهُ وَهُوَ عَلَيْهِ شَاقٌ فَلَهُ أَجْرَانِ) .

واتە: ئەگەر ئەو کەسەی کە قورئان دەخوێنێت بەتەواوی‌و زیرەکی بیخوێنێت ئەوا لەگەڵ فریشتە بەڕێزە چاکەکاندایە، وە ئەو کەسەی کە دەیخوێنێت وە قورسە لەسەری بۆی نایات ئەوا دوو پاداشتی هەیە.

٥٢- (مَا كَرِهْتَ أنْ يَراهُ النَّاسُ مِنْكَ فَلا تَفْعَلْهُ بِنَفْسِكَ إذا خَلَوتَ) .

واتە: ئەوەی کە پێت ناخۆشە خەڵکی بتبینێت کە تەنهایش بویت مەیکە.

٥٣- (مَا مَلأَ آدَمِيٌّ وِعَاء شَرّاً مِنْ بَطْنٍ، بِحَسْبِ ابنِ آدَمَ أُكُلاَتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فإنْ كانَ لا مَحالَةَ فثُلُثٌ لِطَعَامِهِ، وَثُلُثٌ لِشَرابِهِ، وَثُلُثٌ لِنَفَسِهِ) .

واتە: ئادەمیزاد هیچ شتێکی پڕ نەکردووە خراپتر لە سکی، ئادەمیزاد چەند پارویەکی بەسە کە بتوانێت ڕایبگرێت، ئەگەر هەر زیاتری خوارد ئەوا با سێ یەکی بۆ خواردن و سێ یەکی بۆ خواردنەوەو سێ یەکیشی بۆ هەناسەدان دانێت.

٥٤- (مَا مِنْ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَعُودُ مُسْلِمًا إِلَّا ابْتَعَثَ اللَّهُ سَبْعِينَ أَلْفَ مَلَكٍ يُصَلُّونَ عَلَيْهِ فِي أَيِّ سَاعَاتِ النَّهَارِ كَانَ حَتَّى يُصْبِحَ) .

واتە: هیچ مرۆڤێکی موسڵمان نیە سەردانی موسڵمانێك بكات ئیلا خوای گەورە حەفتا هەزار فریشتە دەنێرێت دوعای خێری بۆ دەكەن لە هەركاتێكی ڕۆژدا بێت تا بەیانی دەكاتەوە.

٥٥- (مَا مِنْ خَارِجٍ يَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ فِي طَلَبِ الْعِلْمِ إِلاَّ وَضَعَتْ لَهُ الْمَلاَئِكَةُ أَجْنِحَتَهَا رِضًا بِمَا يَصْنَعُ حَتَّى يَرْجِعَ).

واتە: هیچ كەسێك نیە كەلەماڵ دەرچێت بۆ گەڕان بە دوای زانستی شەرعی ئیلا فریشتە باڵی ڕەزامەندی بۆ دادەنێت بۆ ئەو كارەی كە دەیكات تا دەگەڕێتەوە.

٥٦- (مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْجُدُ لِلَّهِ سَجْدَةً إِلَّا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ بِهَا حَسَنَةً، وَمَحَا عَنْهُ بِهَا سَيِّئَةً، وَرَفَعَ لَهُ بِهَا دَرَجَةً، فَاسْتَكْثِرُوا مِنْ السُّجُودِ) .

واتە: هیچ بەندەیەك نیە كڕنوشێك بۆ خوای گەورە ببات ئیلا خوای گەورە چاكەیەكی بۆ دەنوسێت، وە خراپەیەكی لێ دەسڕێتەوە، وە پلەیەك پێی بەرز دەكاتەوە، بۆیە زۆر سوجدە بۆ خوای گەورە ببەن.

٥٧- (مَا مِنْ يَوْمٍ يُصْبِحُ الْعِبَادُ فِيهِ إِلَّا مَلَكَانِ يَنْزِلَانِ فَيَقُولُ أَحَدُهُمَا: اللَّهُمَّ أعْطِ مُنْفِقًا خَلَفًا وَيَقُولُ الْآخَرُ: اللَّهُمَّ أَعْطِ مُمْسِكًا تَلَفاً) .

واتە: هیچ ڕۆژێك نیە كەبەندەكان ڕۆژی تیا بكەنەوە ئیلا دوو فریشتە دادەبەزن یەكێكیان دەڵێت: خوایە هەركەسێك لە پێناو تۆدا ماڵی دەبەخشێت شوێنی بۆ پڕ بكەرەوە، وە ئەوەی تریان دەڵێت خوایە هەر كەسێك لە پێناو تۆدا ماڵ نابەخشێت و دەیگرێتەوە لەناوی بەرەو بیفەوتێنە.

٥٨- (مَنْ أَكَلَ طَعَامًا ثُمَّ قَالَ: الحْمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنِي هَذَا الطَّعَامَ وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلَا قُوَّةٍ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ ).

واتە: هەر كەسێك خواردنێكی خوارد بڵێت: حەمدو سوپاس بۆ ئەو خوایەی كەوا ئەم خواردنەی پێ بەخشیم بە بێ هیچ هەوڵ و توانایەكەوە لە من ئەوا خوای گەورە لە تاوانەكانی پێشووی خۆش دەبێت.

٥٩- (مَنْ لَبِسَ ثَوْبًا فَقَالَ: الحْمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَسَانِي هَذَا مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلَا قُوَّةٍ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ ) .

واتە: هەركەسێك پۆشاكێك لەبەر بكات و بڵێت: حەمدو سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە ئەم پۆشاكەی پێ پۆشیمو پێ بەخشیم بە بێ هیچ هەوڵ و تێكۆشانێكەوە لە من ئەوا خوای گەورە لە تاوانەكانی پێشوو پاشی خۆش دەبێت.

٦٠- (لَا تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قُبُوراً، وَلَا تَجْعَلُوا قَبْرِي عِيداً، وَصَلُّوا عَلَيَّ فَإِنَّ صَلَاتكُمْ تَبْلُغُنِي حَيْثُ كُنْتُمْ ) .

واتە: ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕ، وە گۆڕەکەی من مەکەن بە جەژن، وە سەڵاوات لەسەرم بدەن چونکە بەڕاستی سەڵاوات دانتان لەسەر من پێم دەگات لە هەرشوێنێك بن.

٦١- (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَيْلٌ لِلْعَرَبِ مِنْ شَرٍّ قَدِ اقْتَرَبَ، فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مِثْلُ هَذِهِ- وَحَلَّقَ بِإِصْبَعَيهِ الْإِبْهَامِ وَالَّتِي تَلِيهَا- قِيلَ: أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ؟ قَالَ:(نَعَمْ إِذَا كَثُرَ الخَبَثُ) .

واتە: هیچ پەرستراوێك نیە بە حەق شایەنی پەرستن بێت جگە لە الله، هاوار بۆ عەرەب لە شەڕو خراپەیەك کە نزیك بۆتەوە، ئەمڕۆ لە بەست و بەنداوی یەئجوج و مەئجوج وەکو ئەمەی لێ کرایەوە هەردوو (پەنجەی ئەسپێ کوژەو دۆشاو مژە) پەنجە گەورەکەو پەنجەی شایەتمان بازنەیی کرد، ووترا: ئایا لەناو دەچین کاتێك پیاو چاکانمان تێدا بێت؟ فەرمووی: بەڵێ ئەگەر خراپەو تاوان زۆر بوو.

# قۆناغی هەشتەم

١- (إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: أَيْنَ الْمُتَحَابُّونَ بِجَلاَلِي الْيَوْمَ أُظِلُّهُمْ فِي ظِلِّي يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلِّي) .

واتە: بەڕاستی خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا دەفەرمێت: کوان ئەوانەی لە پێناو مندا یەکتریان خۆش دەویست ئەمڕۆ ئەیانخەمە ژێر سێبەری خۆمەوە لە ڕۆژێکدا کە هیچ سێبەرێك نیە جگە لە سێبەری خوا.

٢- (إِنَّ الْمُؤْمِنَ يُجَاهِدُ بِسَيْفِهِ وَلِسَانِهِ ) .

واتە: بەڕاستی باوەڕدار جیهاد دەکات بە شمشێرو بە زمانی.

٣- (إِنَّ لِلَّهِ أَهْلِينَ مِنْ النَّاسِ: أَهْلُ الْقُرْآنِ هُمْ أَهْلُ اللَّهِ وَخَاصَّتُهُ).

واتە: بەڕاستی خوای گەورە لەناو خەڵکیدا کەسوکاری هەیە کە: ئەهلی قورئانن ئەمانە ئەهلی خواو تایبەتەکانی خوای گەورەن.

٤- (إِنَّمَا الْعِلْمُ بِالتَّعَلُّمِ، وَالْحِلْمُ بِالتَّحَلُّمِ، وَمَنْ يَتَحَرَّ الْخَيْرَ يُعْطَهُ، وَمَنْ يَتَوَقَّ الشَّرَّ يُوَقَّهُ).

واتە: بەڕاستی زانست بە فێر بوونە، وە ئارامگرتن بە زۆر لە خۆکردنە لەسەر ئارامگرتن، وە هەرکەسێك داوای خێرو چاکە بکات و بەدوایدا بگەڕێت پێی دەبەخشرێت، وە هەرکەسێك خۆی لەشەڕ و خراپە بپارێزێت دەپارێزرێت.

٥- (أَيُّمَا مُسْلِمَيْنِ الْتَقَيَا فَأَخَذَ أَحَدُهُمَا بِيَدِ صَاحِبِهِ فَتَصَافَحَا وحَمِدَا اللَّهَ تَعَالَى جَمِيعاً تَفَرَّقَا لَيْسَ بَيْنَهُمَا خَطِيئَةٌ ) .

واتە: هەر دوو موسڵمانێك بەیەك بگەن و یەكێكیان دەستی هاوڕێكەی بگرێت و تەوقە بكەن و هەردووكیان حەمدی خوا بكەن كە لێك جیا بونەوە هەردوكیان هیچ تاوانێكیان لە نێواندا نامێنێت.

٦- (الْحَيَاءُ مِنَ الْإِيمَانِ، وَالْإِيمَانُ فِي الْجَنَّةِ، وَالْبَذَاءُ مِنَ الْجَفَاءِ، والْجَفَاءِ فِي النَّارِ ) .

واتە: شەرم ئابڕوو لەباوەڕەوەیە، وە باوەڕیش لەبەهەشتدایە، وە قسەی ناشرین لە زبری و وشكی و ڕەقیدایە، وە ڕەقی و وشكیش لە ئاگردایە.

٧- (مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُشَاكُ شَوْكَةً فَمَا فَوْقَهَا إِلَّا كُتِبَتْ لَهُ بِهَا دَرَجَةٌ وَمُحِيَتْ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةٌ).

واتە: هیچ موسڵمانێك نیە كە دڕكێك یان زیاتر ئازاری پێ بگەیەنێت ئیلا پلەیەكی بۆ دەنوسرێت و تاوانێكی لێ دەسڕێتەوە.

٨- (مَنْ أَكَلَ أَوْ شَرِبَ نَاسِيًا فَلَا يُفْطِرْ، فَإِنَّمَا هُوَ رِزْقٌ رَزَقَهُ اللَّهُ).

واتە: هەركەسێك شتێكی خوارد یان خواردەوە بەلەبیر چوون ئەوا با ڕۆژووەكەی نەشكێنێت چونكە ئەوە ڕۆزیەكە خوای گەورە پێی بەخشیووە.

٩- (مَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ، وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، لَا أَقُولُ: آلم حَرْفٌ.ولكن: أَلْفٌ حَرْفٌ، وَلَامٌ حَرْفٌ، وَمِيمٌ حَرْفٌ ) .

واتە: هەرکەسێك پیتێك لە قورئان بخوێنێت ئەوا چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت، چاکەیش یەك بەدەیە، ناڵێم ئەلیف لام میم پیتێکە، بەڵام ئەلیف پیتێکە، و لام پیتێکە، و میم پیتێکە.

١٠- (لَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثِ لَيَالٍ، يَلْتَقِيَانِ فَيُعْرِضُ هَذَا وَيُعْرِضُ هَذَا، وَخَيْرُهُمَا الَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلَامِ ) .

واتە: حەڵاڵ نیە بۆ هیچ موسڵمانێك کە قسە لەگەڵ براکەیدا نەکات زیاتر لە سێ شەو، بگەن بەیەکتر ئەم پشت لەو بکات و ئەویش پشت لەم بکات، باشترینیان ئەو کەسەیە کە دەستپێشخەری دەکات لەسەلام کردندا.

١١- (لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ أَحَدٌ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ كِبْرِيَاءَ).

واتە: ناچێتە بەهەشتەوە هەرکەسێك بە ئەندازەی گەردی ناوکی خەردەلەیەك خۆبەگەورە زانین لە دڵیدا هەبێت.

١٢- (إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ، وَيُعْطِي عَلَى الرِّفْقِ مَا لَا يُعْطِي عَلَى الْعُنْفِ، وَمَا لَا يُعْطِي عَلَى مَا سِوَاهُ ) .

واتە: خـوای گـەورە نـەرم و نیانـەو نـەرم و نیـانی خـۆش دەوێـت، وە ئـەوەی بەنەرمونیانی دەیبەخشێت نایبەخشێت بە توندو تیـژی وە نایبەخشـێت بـە هیچـی تر.

١٣- (إِنَّ الْبِرَّ أَنْ يَصِلَ الرَّجُلُ أَهْلَ وُدِّ أَبِيهِ بَعْدَ أَنْ يُوَلِّيَ الأبُ) .

واتە: بەڕاستی چاکە ئەوەیـە کـە پیـاو سـەردانی خۆشەویسـتانی بـاوکی بکـات پاش مردنی باوکی.

١٤- (إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي عَمَّا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا مَا لَمْ تَتَكَلَّمْ، أَوْ تَعْمَلْ به) .

واتە: خـوای گـەورە بـوراوە لـە ئوممەتەکـەم و بـەتاوان ناینوسـێت لەسـەریان هەرشتێك بەدڵ بیڵێن مادام بە قسە نەیڵێن یان بە کردەوە نەیکەن.

١٥- (إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ) .

واتە: خوای گەورە بوراوە لە ئوممەتەکەم و بەتاوان لەسـەریان نانوسـرێت هـەر شتێك بە هەڵە بیکەن یان لە بیریان بچێت یان بە زۆر پێیان ئەنجام بدرێت.

١٦- (إِنَّهَا لَيْسَتْ بِنَجَسٍ، إِنَّهَا مِنَ الطَّوَّافِينَ عَلَيْكُمْ وَالطَّوَّافَاتِ » – يَعْنِي: الهِرَّةَ ).

واتە: پشیلە پیس نیەو ئەو هەمیشە بە دەورتاندا دێت و دەڕوات.

١٧- (أَيُّمَا رَجُلٍ آتاهُ اللهُ عِلْماً فَكَتَمَهُ أَلْجَمَهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِلِجَامٍ مِنْ نَارٍ) .

واتە: هەرکەسێك خوای گەورە زانستێکی پێ ببەخشێت ئەویش بڵاوی نەکاتەوەو بیشارێتەوە ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە لغاوی ئاگرین دەکاتە دەمی.

١٨- (دُعاءُ المَرْءِ المُسْلِمِ مُسْتَجابٌ لِأَخِيهِ بِظَهْرِ الغَيبِ عِنْدَ رَأْسِهِ مَلَكٌ مُوَكَّلٌ، كُلَمَا دَعَا لِأَخِيهِ بِخَيرٍ قَالَ المَلَكُ: آمِينَ، وَلَكَ بِمِثلِ ذَلِكَ ) .

واتە: دوعای موسڵمان بۆ موسڵمان بە نهێنی وەرگیراوە، فریشتەیەك لەلای سەریەوە ڕاوەستاوە پێی سپێردراوە هەرکاتێك ئەم دوعای چاك بۆ براکەی بکات فریشتەکە دەڵێت: ئامین وە هاوشێوەی ئەو دوعایەیش بۆ خۆت.

١٩- (الطُّهُورُ شَطْرُ الْإِيمَانِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَأُ الْمِيزَانَ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَآنِ – أَوْ تَمْلَأُ – مَا بَيْنَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، وَالصَّلَاةُ نُورٌ، وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ، كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو فَبَائِعٌ نَفْسَهُ فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا).

واتە: دەست نوێژ شۆرین نیوەی ئیمانە، وە الْحَمْدُ لِلَّهِ تەرازووی چاکەکانی مرۆڤ پڕدەکات لە ڕۆژی قیامەتدا، وە سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ نێوان ئاسمان و زەوی پڕ دەکەن، وەنوێژ ڕوناکیە، وە خێر کردن بەڵگەیە بەدەستەوە، وە ئارامگرتن ڕوناکیە، وە قورئان بەڵگەیە بۆت یان دژتە، هەموو خەڵکی بەیانی دەکاتەوە هەیە

خۆی دەفرۆشێت و خۆی ئازاد دەكات لە ئاگری دۆزەخ وە هەیشە خۆی بـە هـیلاك دەبات.

٢٠- (كان ﷺ إِذَا انْصَرَفَ مِنْ صَلَاتِهِ اسْتَغْفَرَ ثَلَاثًا وَقَالَ: «اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ وَمِنْكَ السَّلَامُ تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ»

واتە: پێغەمبەر ﷺ كە لە نوێژە فەرزەكان تـەواو بوایـە سـێ جـار دەیفـەرموو: اسْتَغْفِرُ اللهَ، پاشان دەیفەرموو: اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ وَمِنْكَ السَّلَامُ تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ.

٢١- (كَـانَ ﷺ إِذَا دَخَـلَ الْمَسْـجِدَ قَـالَ: أَعُـوذُ بِاللَّهِ الْعَظِـيمِ، وَبِوَجْهِـهِ الْكَـرِيمِ، وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ، مِنْ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، وَقَالَ: إِذَا قَالَ ذَلِكَ قَالَ الشَّيْطَانُ: حُفِظَ مِنِّي سَائِرَ الْيَوْمِ) .

واتە: پێغەمبـەر ﷺ كـە بچـوایەتە نـاو مزگـەوت دەیفـەرموو أَعُوذُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ، وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ، وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ ، وە دەیفـەرموو: هەركەسـێك كـە وا بلێـت ئـەوا لـە شەیتان دەپارێزرێت لەو ڕۆژەدا.

٢٢- (لَوْ يَعْلَمُ الْمُؤْمِنُ مَا عِنْدَ اللَّهِ مِنَ الْعُقُوبَةِ مَا طَمِعَ فِي الجَنَّة أَحَدٌ، وَلَوْ يُعْلَمُ الْكَافِرُ مَا عِنْدَ اللَّهِ مِنَ الرَّحْمَةِ مَا قَنَطَ مِنَ الجَنَّةِ أَحَدٌ ) .

واتە: ئەگەر باوەڕدار دەیزانی خوای گەورە چ سزایەکی هەیە ئەوا هیچ کەس ئومێدی چوونە بەهەشتی نابوو، وە ئەگەر کافریش بیزانیایە خوای گەورە چەندێ ڕەحم و بەزەیی هەیە ئەوا هیچ کەس بێ ئومێد نابوو لەبەهەشت.

٢٣- (لَيْسَ الْغِنَى عَنْ كَثْرَةِ الْعَرَضِ، وَلَكِنَّ الغِنَى غِنَى النَّفْسِ ) .

واتە: دەوڵەمەندی بە زۆری شتومەك نیە، بەڵکو دەوڵەمەندی دەوڵەمەندی دڵ و دەروونە.

٢٤- (مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَتَوَضَّأُ فَيُحْسِنُ الوُضُوءَ ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ يُقْبِلُ عَلَيْهِمَا بِقَلْبِهِ وَوَجْهِهِ إِلَّا وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ ) .

واتە: هیچ موسڵمانێك نیە دەست نوێژ بشوات بە چاکی پاشان دوو ركات نوێژ بکات دڵ و ڕووی لەسەر بێت ئیلا بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت.

٢٥- (مَا يَكُونُ عِنْدِي مِنْ خَيْرٍ فَلَنْ أَدَّخِرَهُ عَنْكُمْ، وَإنه مَنْ يَسْتَعِفَّ يُعِفَّهُ اللَّهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللَّهُ، وَمَنْ يَتَصَبَّرْ يُصَبِّرْهُ اللَّهُ، وَمَا أُعْطِيَ أَحَدٌ عَطَاءً خَيْراً وَأَوْسَعَ مِنَ الصَّبْرِ) .

واتە: هەر خێرو چاکەیەکم لابێت ئەوا لێتانی هەڵناگرم و لێتانی ناشارمەوە، وە بەڕاستی هەرکەسێك بەدوای پاکیدا بگەڕێت خوای گەورە پاکی دەکاتەوە، وە هەرکەسێك بەدوای دەوڵەمەنیدا بگەڕێت و داوای بکات خوای گەورە دەوڵەمەندی

دەكات، وە هەركەسێك وا لە خۆی بكات ئارام بگرێت خوا ئارامی پێ دەبەخشێت، وە هیچ كەسێك هیچ بەخششێكی باشترو چاكتر و فراوانتری پێ نەبەخشراوە وەك ئارامگرتن.

٢٦- (مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ وَالْجَلِيسِ السَّوْءِ، كَمَثَلِ صَاحِبِ الْمِسْكِ، وَكِيرِ الْحَدَّادِ لَا يَعْدَمُكَ مِنْ صَاحِبِ الْمِسْكِ إِمَّا تَشْتَرِيهِ، أَوْ تَجِدُ رِيحَهُ، وَكِيرُ الْحَدَّادِ يُحْرِقُ بَدَنَكَ أَوْ ثَوْبَكَ، أَوْ تَجِدُ مِنْهُ رِيحًا خَبِيثَةً) .

واتە: نمونەی هاوڕێی چاكو هاوڕێی خراپ وەكو نمونەی خاوەن میسك و كورەی ئاسنگەر وایە، خاوەن میسكەكە بێ بەشت ناكات یان لێی دەكڕیت یان بۆنی خۆش دەكەیت، بەڵام كورەی ئاسنگەرماڵت دەسوتێنێت یان پۆشاكەكەت یان هەست بە بۆنی ناخۆش دەكەیت.

٢٧- (نَهَى ﷺ عَنِ النَّومِ قَبْلَ العِشَاءِ وَالحَدِيثِ بَعْدَهَا) .

واتە: پێغەمبەری ﷺ خوا قەدەغەی خەوتنی كردووە لە پێش نوێژی عیشاو قسە كردن لە پاش نوێژی عیشا.

٢٨- (لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ ) .

واتە: هەركەسێك سورەتی فاتیحە نەخوێنێت ئەوا نوێژی بۆ نیەو نوێژەكەی بەتاڵە.

٢٩- (المُتَمَسِّكُ بِسُنَّتِي عِنْدَ اخْتِلافِ أُمَّتِي كَالقَابِضِ عَلَى الجَمْرِ) .

واتە: دەست گرتوو بە سوننەتەکەمەوە لە کاتی جیاوازی و ناکۆکی ئوممەتەکەم وەکو ئەوەیە چنگی بە پشکۆی ئاگردا کردبێت.

٣٠- (الْمَلَائِكَةَ تُصَلِّي عَلَى أَحَدِكُمْ مَا دَامَ فِي مُصَلَّاهُ الَّذِي صَلَّى فِيهِ، مَا لَمْ يُحْدِثْ أو يَقُمْ).

واتە: فریشتە دوعا بۆ یەکێك لە ئێوە دەکات هەتا لە شوێنی نوێژەکەی دانیشێت کە نوێژی لێ کردووە بەمەرجێك دەست نوێژی نەشکێت یان هەڵنەسێت.

٣١- (نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ: الصِّحَّةُ وَالْفَرَاغُ ) .

واتە: دوو بەخشش هەیە زۆرێك لە خەڵكی لێی سودمەند نین و بێ بەشن: لەش ساغی و دەست بەتاڵی.

٣٢- (وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ وَبُطُونِ الأَقْدامِ مِنَ النَّارِ) .

واتە: هاوارو سزا بۆ ئەو کەسانەی کە پاژنەو ناوپێیان تەڕ ناکەن لەکاتی دەست نوێژ شۆریندا.

٣٣- (نَهَى رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ الشِّرَاءِ وَالْبَيْعِ فِي الْمَسْجِدِ وَأَنْ تُنْشَدَ فِيهِ ضَالَّةٌ، وَأَنْ يُنْشَدَ فِيهِ شِعْرٌ، وَنَهَى عَنْ التَّحَلُّقِ قَبْلَ الصَّلَاةِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ) .

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کڕین و فرۆشتنی کردووە لە ناو مزگەوتدا، یاخود بانگی شتی ونبوی تێدا بکرێت، یاخود شیعری تێدا بوترێت، وە قەدەغەی بازنە بەستنی کردووە پێش نوێژ لە ڕۆژی هەینی.

٣٤- (نَهَى عَنِ الصَّلاَةِ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَبَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ)

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە لە دوای نوێژی بەیانی نوێژ بکرێت تا خۆر هەڵدێت، وە لەپاش نیوۆژی عەسر تا خۆر ئاوا دەبێت.

٣٥- (لَا يَزَالُ قَوْمٌ يَتَأَخَّرُونَ عَنِ الصَّفِّ الْأَوَّلِ حَتَّى يُؤَخِّرَهُمُ اللَّهُ فِي النَّارِ ) .

واتە: بەردەوام کەسانێك دوا دەکەون لەڕیزی یەکەمی نوێژ تا خوای گەورە دوایان دەخات لەناو ئاگری دۆزەخدا.

٣٦- (لَا يَقْعُدُ قَوْمٌ يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا حَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَنَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ ) .

واتە: هیچ کۆمەڵە کەسێك نیە دانیشن زیکری خوای گەورە بکەن ئیلا فریشتەکان دەوریان دەگرن، وە ڕەحمەتی خوای گەورە دایان دەپۆشێت، وە هێمنی و ئارامی دادەبەزێتە سەریان، وە خوای گەورە لە لای فریشتەکانی لای خۆی بە چاکە باسیان دەکات.

٣٧- (لَا يَقُلْ أَحَدُكُمْ نَسِيتُ آيَةَ كَيْتَ وَكَيْتَ بَلْ هُوَ نُسِّيَ).

واتە: با یەکێك لە ئێوە نەڵێت: ئەو ئایەتەو ئەو ئایەتەم بیر چووە بەڵکو ئەو لە بیری براوەتەوە.

٣٨- (يُجْزِي عَنِ الْجَمَاعَةِ إِذَا مَرُّوا أَنْ يُسَلِّمَ أَحَدُهُمْ، وَيُجْزِي عَنِ الْجُلُوسِ أَنْ يَرُدَّ أَحَدُهُمْ) .

واتە: یەکێك سەلام بکات لە جیاتی کۆمەڵێك بەسیانە، وە یەکێك وەڵام بداتەوە لە جیاتی کۆمەڵێك بەسیانە.

٣٩- (لا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ فَهُوَ يَقُومُ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا فَهُوَ يُنْفِقُه آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ) .

واتە: ئاوات خواستن نیە باشتر لەم دوو جۆرە: پیاوێك خوای گەورە قورئانی پێ بەخشیبێت ئەویش بە درێژایی شەو لە شەو نوێژو بەڕۆژ بیخوێنێت، وە پیاوێك خوای گەورە ماڵی پێ بەخشیووە ئەو بەدرێژایی شەو و ڕۆژ لە پێناو خوای گەورەدا دەیبەخشێت، دروستە تۆیش ئاوات بخوازیت تاکو وەکو ئەوانت لێ بێت و تاوەکو وەکو ئەوان بکەیت.

٤٠- (مَنِ احْتَبَسَ فَرَسًا فِي سَبِيلِ اللهِ إِيمَانًا باللهِ وتصْديقاً بِوَعْدِهِ، فإِنَّ شِبَعَه وَرِيَّه وَرَوْثَهُ وَبَوْلَه فِي مِيزَانِهِ يَوْمَ الْقِيَامَة يَعْنِي: الحَسَنَاتِ ) .

واتە: هەرکەسێك ئەسپێك لە پێناو خوای گەورە دابنێت بۆ جیهاد کردن باوەڕی بە پاداشت و بەڵێنەکەی خوای گەورە هەبێت ئەوا تێر ئالیك کردن و تێر ئاو کردنی و پاشەڕۆو میزەکەی دەخرێتە تەرازووی کردەوە چاکەکانی لە ڕۆژی قیامەت واتە: هەمووی بە چاکە بۆ دەنوسرێت.

٤١- (الشُّهَدَاءُ عَلَى بَارِقِ نَهْرٍ بِبَابِ الْجَنَّةِ فِي قُبَّةٍ خَضْرَاءَ يَخْرُجُ إِلَيْهِمْ رِزْقُهُمْ مِنَ الْجَنَّةِ بُكْرَةً وَعَشِيًّا ) .

واتە: شەهیدەکان لەسەر ڕوبارێك ئاون لە دەریای دەرگای بەهەشتن لە گومەزێکی سەوز ڕۆزیان لەبەهەشتەوە بۆ دێت بەیانیان و ئێواران.

٤٢- (الْحَلَالُ بَيِّنٌ وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا مُشْتَبِهَاتٌ، لَا يَعْلَمُها كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ، فَمَنِ اتَّقَى الشُّبُهاتِ فَقَدِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ) .

واتە: حەڵاڵ ئاشکرایەو حەرام ئاشکرایە وە لە نێوانیاندا چەند کارێکی گوماناوی هەیە زۆرێك لە خەڵکی نایزانن بۆیە هەرکەسێك خۆی لە گومان بپارێزێت ئەوا دین و ناموسی پارێزراو دەبێت.

٤٣- (الْمُؤْمِنُ يَأْلَفُ وَيُؤْلَفُ، وَلاَ خَيْرَ فِيمَنْ لاَ يَأْلَفُ وَلاَ يُؤْلَفُ، وَخَيرُ النَّاسِ أَنْفَعُهُمْ لِلنَّاسِ).

واتە: باوەڕدار خەڵکی خۆش دەوێت و خەڵکیش ئەویان خۆش دەوێت، وە خێر لە کەسێکدا نیە کە خەڵکی خۆش نەوێت و خەڵکیش ئەویان خۆش نەوێت، وە باشترین کەس ئەوەیە کە سودمەنترین بێت بۆ خەڵکی.

٤٤- (مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ، وَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ، وَاللهُ يُعْطِي، وَلَنْ تَزَالَ هذِهِ الأُمَّةُ قَائِمَةً عَلَى أَمْرِ اللهِ، لا يَضُرُّهُمْ مَن خَالَفَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللهِ) .

واتە: هەرکەسێك خوای گەورە خێرو چاکەی بۆ بوێت لە دین شارەزای دەکات، بەڵام من تەنها دابەشکارم خوای گەورە دەیبەخشێت، وە بەردەوام ئەم ئوممەتە لەسەر دینی خوای گەورە دەبن ئەوەی بیەوێت سەرپێچیان بکات زیانیان پی ناگەیەنن تا ڕۆژی قیامەت.

٤٥- (مَنْ لَا يَرْحَمْ لا يُرْحَم، وَمَنْ لا يَغْفِرُ لا يُغْفَرُ لَهُ ) .

واتە: ئەوەی ڕەحم نەکات ڕەحمی پێ ناکرێت، ئەوەی لێخۆشبوو نەبێت خوا لێی خۆش نابێت.

٤٦- (أَحَبُّ الْكَلَامِ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ مَا اصْطَفَاهُ اللَّهُ لِمَلَائِكَتِهِ سُبْحَانَ رَبِّي وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ رَبِّي وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ رَبِّي وَبِحَمْدِهِ) .

واتە: خۆشەویسترین قسە ئەو قسەیەیە کە خوای گەورە خۆی هەڵیبـژاردووە بۆ فریشتەکانی کە بریتی یە لـە سُبْحَانَ رَبِّي وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ رَبِّي وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ رَبِّي وَبِحَمْدِهِ.

٤٧- (إذا أتَيْتُمُ الصَّلاةَ فَعَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ، وَلا تَأْتُوهَا وَأنْتُمْ تَسْعَونَ، فَما أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وما فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا) .

واتە: ئەگەر هاتن بۆ نوێـژ بـۆ مزگـەوت ئـەوا بـە هێمنـی و لەسـەرخۆیی وەرن، بەپەلەو ڕاکردن مەیەن، ئەوەندەی فریا کەوتن لەگەڵ ئیمام بیکەن ئەوەیشی فریـا نەکەوتن بۆ خۆتان بیکەن.

٤٨- (إذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ مِنَ اللَّيلِ فَاقْرَأْ {قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ} ثُمَّ نَمْ عَلَى خَاتِمَتِهَا فَإِنَّهَا بَرَاءَةٌ مِنَ الشِّرْكِ) .

واتە: کە شەو چویتە شوێنی نوستنەکەت ئـەوا {قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ}بخوێنـەو لەسەر کۆتاییەکەی بخەوە چونکە بەرائەتە لە شەریك دانان بۆ خوای گەورە.

٤٩- (إذا أصَابَ أحَدَكُمْ همٌّ أو لأْواءٌ فَلْيَقُلْ اللَّهُ، اللَّهُ رَبِّي لاَ أُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە توشی غەم و پەژارە یـان سـەختی و ناخۆشـی بـوو بابڵێت: اللَّهُ، اللَّهُ رَبِّي لاَ أُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا.

٥٠- (إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا, فَقَتَلَ أحَدُهُما صَاحِبَهُ؛ فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ هَذا القَاتِلُ فَمَا بَالُ المَقْتُولِ؟ قَالَ: إنَّهُ كانَ حَرِيصاً عَلَى قَتْلِ صَاحِبِهِ) .

واتە: ئەگەر دوو موسڵمان بە شمشێرەکانیان بەیەك گەیشتن و یەکێکیان ئەوی تری کوشت ئەوا بکوژو کوژراوەکە لە ئاگری دۆزەخدان، وتراوە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە بکوژەکە بۆ ئاگری جەهەنم ئەی کوژراوەکە بۆ؟ فەرمووی: چونکە ئەویش سوور بوو لەسەر کوشتنی هاوڕێکەی بەڵام نەیتوانی.

٥١- (إِذَا تَبَايَعْتُمْ بِالْعِينَةِ، وَأَخَذْتُمْ أَذْنَابَ الْبَقَرِ، وَرَضِيتُمْ بِالزَّرْعِ، وَتَرَكْتُمُ الْجِهَادَ، سَلَّطَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ ذُلاًّ، لاَ يَنْزِعُهُ حَتَّى تَرْجِعُوا إِلَى دِينِكُمْ) .

واتە: ئەگەر کڕین و فرۆشتنتان ڕیبا بوو، وە دەستتان گرت بە کلکی مانگاوە، وە ڕازی بوون بە کشتوکاڵ کردن، وە وازتان لە جیهاد کردن هێنا، ئەوا خوای گەورە زەلیلی زاڵ دەکات بەسەرتانداو لاینابات لەسەرتان تا نەگەڕێنەوە بۆ دینەکەتان.

٥٢- (إِذَا جَمَعَ اللَّهُ النَّاسَ الأَوَّلِينَ وَالآخِرينَ لِيَوْمٍ لَا رَيْبَ فِيهِ نَادَى مُنَادٍ: مَنْ كانَ أشْرَكَ فِي عَمَلٍ عَمِلَهُ للهِ أحَداً فَلْيَطْلُبْ ثَوَابَهُ مِنْ عِنْدِهِ، فَإِنَّ اللَّهَ أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ) .

واتە: کاتێك خوای گەورە سەرەتاکان و کۆتاییەکان کۆ دەکاتەوە لە ڕۆژێکدا کە هیچ گومانێکی تێدا نییە بانگکەرێك بانگ دەکات: هەرکەسێك لە هەر کردەوەیەك کە کردوویەتی کەسێکی کردووە بە شەریك بۆ خوا با بچێت داوای پاداشت لەو کەسە بکات، چونکە بەڕاستی خوای گەورە دەوڵەمەندترین شەریکەکانە لە شیرك و پێویستی بەشەریك نییە.

٥٣- (إذا حَكَمْتُمْ فَاعْدِلُوا، وَإذا قَتَلْتُمْ فَأحْسِنُوا، فَإنَّ اللهَ مُحْسِنٌ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ )

واتە: ئەگەر بڕیارتاندا دادپەروەر بن، وە ئەگەر قسەتان کرد چاك بڵێن، چونکە بەڕاستی خوای گەورە چاکەو چاکەکارانی خۆش دەوێت.

٥٤- (إذا حَلَفَ أحَدُكُمْ فَلا يَقُلْ: مَا شَاءَ اللَّهُ وَشِئْتَ، وَلكِنْ لِيَقُلْ مَا شَاءَ اللَّهُ ثم شِئْتَ ).

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە سوێندی خوارد با نەڵێت خوا ویستی لێ بێت و تۆ ویستت لێ بێت، بەڵام بابڵێت: خوا ویستی لێ بێت پاشان تۆ ویستت لێ بێت.

٥٥- (إذا زَخْرَفْتُمْ مَساجِدَكُمْ وَحَلَّيْتُمْ مَصَاحِفَكُمْ فَالدَّمَارُ عَلَيكُمْ ) .

واتە: ئەگەر مزگەوتەکانتان زەخرەفە کرد وە قورئانەکانتان ڕازاندەوە ئەوا لەناو چوون بۆ ئێوەیە.

٥٦- (إِذَا سَمِعْتُمْ أَصْوَاتَ الدِّيَكَةِ، فَسَلُوا اللَّهَ مِنْ فَضْلِهِ فَإِنَّهَا رَأَتْ مَلَكًا، وَإِذَا سَمِعْتُمْ نَهِيقَ الحْمِيرِ، فَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنَ الشيطان، فَإِنَّهَا رَأَتْ شَيْطَانًا) .

واتە: ئەگەر گوێتان لە دەنگی کەڵەشێر بوو ئەوا داوای فەزڵی خوای گەورە بکەن، چونکە ئەوە فریشتەی بینیووە، وە ئەگەر گوێتان لە زەڕینی کەر بوو ئەوا پەنا بە خوای گەورە بگرن لەشەیتان چونکە ئەو شەیتانی بینیووە.

٥٧- (إذا ظَهَرَ الزِّنَا وَالرِّبَا فِي قَرْيَةٍ فَقَدْ أحَلُّوا بِأَنْفُسِهِمْ عَذابَ اللهِ) .

واتە: ئەگەر لە هەر گوندێك یان شارێك زیناو ڕیبا پەیدا بوو ئەوا بە دەستی خۆیان سزای خوای گەورەیان هێناوە بۆ سەر خۆیان.

٥٨- (إذا جَاءَ الرَّجُلُ يَعُودُ مَرِيضًا فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ اشْفِ عَبْدَكَ فُلاناً يَنْكَأُ لَكَ عَدُوًّا، أو يَمْشِي لَكَ إلى الصَّلاةِ ) .

واتە: ئەگەر پیاو سەردانی نەخۆشی کرد با بڵێت: خوایە شیفای فلاَنە بەندەت بدەیت دوژمنت بۆ دەکوژێت یان لەبەر تۆ دەچێت بۆ نوێژی بە کۆمەڵ.

٥٩- (إِذَا غَضِبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْكُتْ) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە توڕە بوو با بێدەنگ بێت.

# قۆناغی نۆیەم

١- (آمُرُكُمْ بِثَلَاثٍ وَأَنْهَاكُمْ عَنْ ثَلَاثٍ: آمُرُكُمْ أَنْ تَعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَأَنْ تَعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَتَفَرَّقُوا، وَ تَسْمَعُوا وَتُطِيعُوا لِمَنْ وَلَّاهُ اللَّهُ أَمْرَكُمْ، وأَنْهَاكُمْ عَنْ قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةِ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةِ المَالِ) .

واتە: فەرمانتان بە سێ شت پێ دەکەمو قەدەغەتان دەکەم لە سێ شت: فەرمانتان پێ دەکەم کە خوای گەورە بپەرستن و هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار نەدەن، وە هەمووتان دەست بە دینی خوای گەورەوە بگرنو پارچە پارچە مەبن، وە گوێ بگرن و گوێڕایەڵ بن بۆ ئەو کەسەی کە خوای گەورە دەیکات بە فەرمانڕەواتان، وە قەدەغەتان دەکەم لە وتراوەو دەڵێت، وەزۆر پرسیار کردن، وە فەوتاندنی سامان و ماڵ.

٢- (لَوْ كَانَتِ الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ مَا سَقَى كَافِرًا مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ )

واتە: ئەگەر دونیا لای خوای گەورە کێشی باڵە مێشولەیەکی هەبوایە ئاوا قومە ئاوێکی بە کافر نادا .

٣- (أَبْشِرُوا، فَإِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ طَرَفُهُ بِيَدِ اللهِ وَطَرَفُهُ بِأَيْدِيكُمْ، فَتَمَسَّكُوا بِهِ فَإِنَّكُمْ لَنْ تَهْلِكُوا وَلَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ أَبَدًا) .

واتە: موژدە بێت لێتان چونکە بەڕاستی ئەم قورئانە لایەکی بەدەست خوای گەورەوەیە وە لایەکی بەدەست ئێوەوەیە دەستی پێوە بگرن ئێوە هەرگیز بە هیلاك ناچن و هەرگیز لە پاش قورئان گومڕا نابن.

٤- (أَبْشِرُوا، هَذَا رَبُّكُمْ قَدْ فَتَحَ بَابًا مِنْ أَبْوَابِ السَّمَاءِ يُبَاهِي بِكُمْ الْمَلَائِكَةَ يَقُولُ: انْظُرُوا إِلَى عِبَادِي قَدْ قَضَوْا فَرِيضَةً وَهُمْ يَنْتَظِرُونَ أُخْرَى) .

واتە: موژدە بێت لێتان ئەمە پەروەردگارتانە دەرگایەك لە دەرگاکانی ئاسمانی کردەوە شانازی بە ئێوەوە دەکات بەسەر فریشتەکانداو دەفەرمێت: تەماشای بەندەکانم بکەن فەرزێکی نوێژیان کردو چاوەڕوانی فەرزێکی ترن.

٥- (إِيَّاكَ وَإِسْبَالَ الإِزَارِ، فَإِنَّ إِسْبَالَ الإِزَارِ مِنْ الْمَخِيلَةِ، وَلاَ يُحِبُّها اللهُ، وَإِنِ امْرُؤٌ شَتَمَكَ وَعَيَّرَكَ بِأمْرٍ لَيْسَ هُوَ فِيكَ، فَلاَ تُعَيِّرْهُ بِأَمْرٍ هُوَ فِيهِ، وَدَعْهُ يَكُونُ وَبَالُهُ عَلَيْهِ، وَأَجْرُهُ لَكَ، وَلا تَسُبَّنَّ أَحَداً) .

واتە: ئاگادارت دەکەمەوە لە پۆشاك درێژی، چونکە بەڕاستی پۆشاك درێژی لە خۆبەگەورە زانینەوەیە وە خوای گەورە خۆشی ناوێت، وە ئەگەر کەسێك جوێنی پێ دایت وە تانەو تەشەری لێ دایت بەشتێك کەتێتدا نەبوو ئەوا تۆ تانەو تەشەری لێ مەدە بە شتێك کە تێیدا هەیە، وە وازی لێ بێنە تاوانەکە لەسەر شانی ئەو دەبێت وە پاداشتەکە بۆ تۆ دەبێت، وە جوێن بە هیچ کەسێك مەدە.

٦- (أَتَيْتُ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي عَلَى قَوْمٍ تُقْرَضُ شِفَاهُهُمْ بِمَقَارِيضَ مِنْ نَارٍ، كُلَّمَا قُرِضَتْ وَفَتْ، قُلْتُ: مَنْ هَؤُلَاءِ يَا جِبْرِيلُ؟ قَالَ: هَؤُلَاءِ خُطَبَاءُ أُمَّتِكَ الَّذِينَ يَقُولُونَ مَا لا يَفْعَلُونَ، وَيَقْرَءُونَ كِتَابَ اللهِ وَلَا يَعْمَلُونَ بِهِ) .

واته: لەشەوی شەورەویدا چومە لای کەسانێك کە دەمو لێویان بە مقەستی ئاگرین دەبڕدرا هەر جارێك ببڕدرایە چاك دەبوەوە، ووتم: ئەی جبریل ئەمانە کێن؟ فەرمووی: ئەمانە وتاربێژانی ئوممەتەکەتن کە ئەو شتانەی کە دەیڵێن بە کردەوە نایکەن وە قورئان دەخوێنن و کاری پێ ناکەن.

٧- (اثْنَتَانِ يَكْرَهُهُمَا ابْنُ آدَمَ : يَكْرَهُ الْمَوْتَ وَالْمَوْتُ خَيْرٌ لَهُ مِنَ الْفِتْنَةِ، وَيَكْرَهُ قِلَّةَ الْمَالِ، وَقِلَّةُ الْمَالِ أَقَلُّ لِلْحِسَابِ) .

واته: دوو شت ئادەمیزاد ڕقی لێیانە: ڕقی لە مردنەو مردن باشترە بۆی لە فیتنە، وە ڕقی لە کەمی ماڵە وە کەمی ماڵ کەمتر لێپرسینەوەی لەسەرە.

٨- (اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ: الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَالسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ الْغَافِلَاتِ) .

واته: خۆتان بپارێزن و دوور بکەنەوە لە حەوت کردار کە بە هیلاکت دەدەن: شەریك دانان بۆ خوا، وە جادو کردن، وە کوشتنی بە ناحەق، وە خواردنی ڕیبا،

وە خـواردنی مـاڵی هـەتیوو، وە ڕاکـردن لـە کـاتی ڕووبەڕووبونـەوەی دوژمـن، وە تۆمەتبارکردنی ئافرەتانی داوێن پاکی باوەڕداری بێ ئاگا بە داوێن پیسی.

٩- (أحَبُّ النَّاسِ إلى اللهِ أنْفَعُهُمْ لِلنَّاسِ، وَأحَبُّ الأعْمَالِ إلى اللهِ سُرُورٌ تُدْخِلُه على مُسْلِمٍ، أو تَكْشِفُ عَنْهُ كُرْبَةً، أوْ تَقْضِيَ عَنْهُ دَيْناً، أو تَطْرُدُ عَنْهُ جُوعاً، وَلأَنْ أمْشِيَ مَعَ أخِي المُسْلِمِ فِى حَاجَةٍ أحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أنْ أعْتَكِفَ فِى هذا المَسْجِدِ شَهْرًا، وَمَنْ كَفَّ غَضَبَهُ سَتَرَ اللهُ عَورَتَهُ، وَمَنْ كَظَمَ غَيْظَهُ وَلَو شَاءَ أنْ يُمْضِيَهُ أَمْضَاهُ مَلأَ اللهُ قَلبَهُ رِضًا يَوْمَ القِيامَةِ، وَمَنْ مَشَى مَعَ أخِيهِ المُسْلِمِ فِى حَاجَةٍ حَتَّى تَتَهَيَّأَ لَهُ أثْبَتَ اللهُ قَدَمَهُ يَومَ تَزِلُّ الأَقْدَامُ، وإنَّ سُوءَ الخُلُقِ لَيُفْسِدُ العَمَلَ كَما يُفْسِدُ الخَلُّ العَسَلَ) .

واتە: خۆشەویسترین کەس لای خوای گەورە ئەوەیە کە سودمەنترین کەس بـن بۆ خەڵکی، وە خۆشەویسترین کردار لای خوای گەورە ئەوەیـە کـە موسـڵمانێك دڵ خۆش بکەیت، یان ناخۆشیەکی لەسەر لابەریت، یان قـەرزێکی بـۆ بدەیتـەوە، یـان برسێتی لەسەر لابەریت، وە ئەگەر لەگەڵ برایـەکی موسـڵمانم بچم بـۆ جـێ بـەجێ کردنی پێویستی و کارێکی پێمخۆشترە یەك مانگ لەم مزگەوتەدا ئیعتکـاف بکـەم، وە هەرکەسـێك تورەبـوونی ڕاگرێـت خـوای گـەورە عـەورەتی دەپارێزێـت، وە هەرکەسـێك تورەبـونی بخواتـەوە و دەری نـەبرێت کـە ئەگـەر ویسـتی لـێ بوایـە دەیتـوانی دەری ببڕێـت ئـەوا خـوای گـەورە دڵـی پـڕ ڕەزامەنـدی دەکـات لـە ڕۆژی قیامەتدا، وە هەرکەسێك لەگەڵ برایـەکی موسـڵمانی بـۆ پێداویسـتیەکی بـڕوات تـا

بۆی جێگیر و جێ بەجێ دەکات ئەوا خوای گەورە پێیەکانی جێگیر دەکات لە ڕۆژێکدا کە پێیەکان دەخلیسکێن، وە ڕەوشتی ناشرین کردار تێك دەدات هەروەکو چۆن سرکە هەنگوین تێك دەدات.

١٠- (ادْعُوا اللَّهَ وَأَنْتُمْ مُوقِنُونَ بِالْإِجَابَةِ، وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ لَا يَسْتَجِيبُ دُعَاءً مِنْ قَلْبٍ غَافِلٍ لَاهٍ ) .

واتە: لە خوا بپاڕێنەوە وە ئێوە دڵنیا بن لە وەڵامدانەوەی خوای گەورە، وە بزانن خوای گەورە وەڵامی دوعا ناداتەوە لە دڵێکی بێ ئاگاو سەرقاڵەوە.

١١- (إِذَا آتَاكَ اللَّهُ مَالًا فَلْيُرَ أَثَرُ نِعْمَةِ اللَّهِ عَلَيْكَ وَكَرَامَتِهِ) .

واتە: ئەگەر خوای گەورە ماڵێکی پێت بەخشی ئەوا با شوێنەواری بەخشش و ڕێزی خوای گەورەت پێوە دیار بێت و پێتەوە ببینرێت.

١٢- (إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ الصَّلَاةَ وَالْإِمَامُ عَلَى حَالٍ فَلْيَصْنَعْ كَمَا يَصْنَعُ الْإِمَامُ ) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە هات بۆ نوێژو ئیمام لەسەر حاڵەتێك بوو لە نوێژ با ئەویش وەکو ئیمام بکات و بچێتە ئەو حاڵەتە.

١٣- (إذا أتيتَ الصَّلاةَ فَأْتِهَا بِوَقَارٍ وَسَكِينَةٍ، فَصَلِّ مَا أَدْرَكْتَ وَاقْضِ مَا فَاتَكَ ) .

واتە: ئەگەر هاتی بۆ نوێژی بە کۆمەڵ ئەوا بە هێمنی و ئارامی و لەسەرخۆ وەرە، ئەوەندەی لەگەڵ ئیمام فریاکەوتی بیکە ئەوەی فریا نەکەوتیت پاشان بە تەنها بیکە.

١٤- (إذا أحْدَثَ أحَدُكُمْ فِي صَلاتِهِ فَلْيَأخُذْ بِأنْفِهِ ثُمَّ لْيَنْصَرِفْ) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە دەستنوێژی شکا با دەست بەلووتی یەوە بگرێت و پاشان بچێتە دەرەوە.

١٥- (إِذَا أَرَادَ اللَّهُ قَبْضَ عَبْدٍ بِأَرْضٍ جَعَلَ لَهُ فِيهَا حَاجَةً ) .

واتە: ئەگەر خوای گەورە بیەوێت گیانی کەسێك لە شوێنێك بکێشێت ئەوا ئیشێکی لەو شوێنە بۆ دروست ئەکات.

١٦- (إذا اسْتَيْقَظَ أحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ: الحَمْدُ للهِ الذِّي رَدَّ عَلَيَّ رُوحِي وَعَافَانِي فِي جَسَدِي وَأذِنَ لِي بِذِكْرِهِ ) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە لەخەو هەڵسا ئەوا بابڵێت: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە گیانی بۆ گەڕاندمەوە وە لەشی پاراستم وەڕێگای دام کە یادی بکەم.

١٧- ( إِذَا أَحَبَّ اللَّهُ عَبْدًا نَادَى جِبْرِيلَ إِنِّي قَدْ أَحْبَبْتُ فُلَانًا فَأَحِبَّهُ قَالَ فَيُنَادِي فِي السَّمَاءِ ثُمَّ تَنْزِلُ لَهُ الْمَحَبَّةُ فِي أَهْلِ الْأَرْضِ فَذَلِكَ قَوْلُ اللَّهِ { إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا

الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمْ الرَّحْمَنُ وُدًّا ﴾ وَإِذَا أَبْغَضَ اللَّهُ عَبْدًا نَادَى جِبْرِيلَ إِنِّي أَبْغَضْتُ فُلَانًا فَيُنَادِي فِي السَّمَاءِ ثُمَّ تَنْزِلُ لَهُ الْبَغْضَاءُ فِي الْأَرْضِ).

واتە: ئەگەر خوای گەورە بەندەیەکی خۆش بوێت بانگ لە جبریل دەکات و دەفەرمێت: من فلانە کەسم خۆش دەوێت تۆیش خۆشت بوێت ئەویش لە ئاسمان بانگ دەکات پاشان خۆشەویستی بۆ دادەبەزێنرێتە سەر زەوی ئەمیش فەرموودەی خوایە کە دەفەرمێت: ئەوانەی باوەڕ دەهێنن و کردەوەی چاك دەکەن خوای گەورە خۆشەویستیان بۆ دادەنێت لە دڵی خەڵکی و فریشتەکاندا، وە ئەگەر خوای گەورە ڕقی لەبەندەیەك بێت ئەوا بانگی جبریل دەکات و دەفەرمێت: من ڕقم لە فلانە کەسە ئەویش لە ئاسمان بانگ دەکات پاشان ڕق و کینەی دادەبەزێنرێت بۆ سەر زەوی‌و خەڵکی ڕقیان لێ دەبێت.

١٨- (إِذَا أَصْبَحَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ: أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَ هَذَا الْيَوْمِ فَتْحَهُ وَنَصْرَهُ وَنُورَهُ وَبِرْكَتَهُ وَهُدَاهُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِيهِ وَمِنْ شَرِّ مَا بَعْدَهُ، ثُمَّ إِذَا أَمْسَى فَلْيَقُلْ مِثْلَ ذَلِكَ ) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە بەیانی لەخەو هەڵسا بابڵێت: ئەمڕۆمان کردەوە موڵك هەمووی بۆ خوای پەروەردگاری هەموو جیهانە، خوایە من داوای خێرو چاکەی ئەمڕۆت لێ دەکەم ئازادی و سەرکەوتن و ڕوناکی و بەرەکەت و هیدایەتی، وە پەنا بە تۆ دەگرم لە هەر شەڕو خراپەیەك کە لەم ڕۆژەدا هەبێت وە شەڕ و

خراپەی پێش و شەڕو خراپەی دوای، پاشان ئەگەر ئێوارەیشی کردەوە هەمان شت دەڵێت.

١٩- (إِذَا اصْطَحَبَ رَجُلَانِ مُسْلِمَانِ فَحَالَ بَيْنَهُمَا شَجَرٌ وَحَجَرٌ وَمَدَرٌ فَلْيُسَلِّمْ أَحَدُهُمَا عَلَى الْآخِرِ، وَيَتَبَادَلُوا السَّلَامَ) .

واتە: ئەگەر دوو پیاوی موسڵمان هاوەڵایەتی یەکتریان کرد پاشان دارێك یان بەردێك یان خانوویەك کەوتە نێوانیانەوە ئەوا با یەکێکیان سەلام لەوی تریان بکات و سەلام بگۆڕنەوە لە نێوان یەکتریدا.

٢٠- (إِذَا أَمَّنَ الإِمَامُ فَأَمِّنُوا، فَإِنَّه مَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ ) .

واتە: ئەگەر ئیمام لە نوێژدا وتی ئامین ئێوەیش بڵێن ئامین، چونکە ئامینی هەرکەسێك لەگەڵ ئامینی فریشتەکان یەك بگرێت ئەوا خوای گەورە لە تاوانی پێشووی خۆش دەبێت.

٢١- (إِذَا أَوَى أَحَدُكُمْ إِلَى فِرَاشِهِ فَلْيَنْفُضْهُ بِدَاخِلَةِ إِزَارِهِ فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي مَا خَلْفَهُ عَلَيهِ ثُمَّ لِيَضْطَجِعْ على شِقِّهِ الأيمنِ ثُمَّ لِيَقُلْ: بِاسْمِكَ رَبِّي وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ أَرْفَعُهُ، إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَارْحَمْهَا، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە چووە سەر جێگای نوستنی ئەوا با بە جلەکەی بەری بیتەکێنێت چونکە ئەو نازانێت چی لەژێر جێگاکەیدایە پاشان لەسەر لای ڕاستی بخەوێت پاشان بڵێت: ئەی پەروەردگارم بەناوی تۆوە لایەکانم دادەنێم وە هەر بەناوی تۆوە بەرزیان دەکەمەوە ئەگەر گیانمت کێشا ئەوا ڕەحممان پێ بکە، وە ئەگەر پێمانتدایەوە ئەوا بیپارێزە بەو شتەی کەوا بەندە چاکەکانی پێ دەپارێزیت.

٢٢- (إذا تَشَهَّدَ أحَدُكُمْ فَلْيَتَعَوَّذْ مِنْ أَرْبَعٍ: مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَفِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ شَرِّ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، ثُمَّ يَدْعُو لِنَفْسِهِ بِمَا بَدَأَ لَهُ) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە تەحیاتی خوێند ئەوا با پەنا بگرێت بە خوای گەورە لە چوار شت: لە سزای ناو گۆڕ، و لە تاقیکردنەوەی ژیان و مردن، و لەشەڕو خراپەی مەسیحی دەججال، پاشان با چ دوعایەکی پێ باش بوو بۆ خۆی دوعا بکات.

٢٣- (إِذَا تَطَهَّرَ الرَّجُلُ، ثُمَّ مَرَّ إِلَى الْمَسْجِدِ يَرْعَى الصَّلاَةَ كَتَبَ لَهُ كَاتِبَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ يَخْطُوهَا إِلَى الْمَسْجِدِ عَشْرَ حَسَنَاتٍ، وَالْقَاعِدُ يَرْعَى الصَّلاَةَ كَالْقَانِتِ، وَيُكْتَبُ مِنَ الْمُصَلِّينَ مِنْ حِينِ يَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ حَتَّى يَرْجِعَ) .

واتە: ئەگەر پیاو لە ماڵ دەست نوێژ بشوات پاشان بچێت بۆ مزگەوت بۆ نوێژ کردن و چاودێری نوێژ بکات ئەوا فریشتە نوسەرەکە بەهەر هەنگاوێك دە چاکەی بۆ دەنوسێت، وە ئەوەی دانیشتووە چاوەڕوانی نوێژ دەکات وەکو ئەوە وایە کە پەرستن دەکات، وە بە نوێژ خوێن دەنوسرێت و هەژمار دەکرێت لەو کاتەی کە لەماڵ دەردەچێت تاکو دەگەڕێتەوە.

٢٤- (إِذَا تَوَضَّأْتَ فَخَلِّلْ بَيْنَ أَصَابِعِ يَدَيْكَ وَرِجْلَيْكَ ) .

واتە: ئەگەر دەست نوێژت شوشت ئەوا دەست بخەرە نێوان پەنجەکانی دەست و پێت تا تەڕ بن.

٢٥- (إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيُسَلِّمْ على النَّبِيِّ ﷺ وَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ. وَإِذَا خَرَجَ فَلْيُسَلِّمْ على النَّبِيِّ ﷺ وَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ)

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە چووە ناو مزگەوت ئەوا با سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بدات و بڵێت: خوایە دەرگاکانی ڕەحمەتی خۆتم لێ بکەرەوە، وە ئەگەر لە مزگەوت دەرچوو با سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بدات و بڵێت: خوایە داوای فەزڵ و چاکەی خۆتت لێ دەکەم.

٢٦- (إِذَا رَأَيْتُمْ مَنْ يَبِيعُ أَوْ يَبْتَاعُ فِي الْمَسْجِدِ فَقُولُوا: لَا أَرْبَحَ اللَّهُ تِجَارَتَكَ. وَإِذَا رَأَيْتُمْ مَنْ يَنْشُدُ فِيهِ ضَالَّةً فَقُولُوا: لَا رَدَّ اللَّهُ عَلَيْكَ ضَالَّتَكَ ) .

واتە: ئەگەر بینیتان کەسێك لە مزگەوت شت دەفرۆشێت یان دەکڕێت ئەوا بڵێن: خوا قازانج نەخاتە بازرگانیەکەتەوە، وە ئەگەر بینیتان کەسێك بانگی شتی ونبوو دەکات لە مزگەوت ئەوا بڵێن: خوا شتە ونبووەکەت بۆ نەگەڕێنێتەوە.

٢٧- (إِذَا سَمِعْتُمْ أَصْوَاتَ الدِّيَكَةِ، فَسَلُوا اللَّهَ مِنْ فَضْلِهِ فَإِنَّهَا رَأَتْ مَلَكًا، وَإِذَا سَمِعْتُمْ نَهِيقَ الْحِمِيرِ، فَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنَ الشَّيطَانِ، فَإِنَّهَا رَأَتْ شَيْطَانًا،) .

واتە: ئەگەر گوێتان لە دەنگی کەڵەشێر بوو ئەوا داوای فەزڵ و چاکەی خوای گەورە بکەن چونکە ئەو فریشتەی بینیووە، وە ئەگەر گوێتان لە زەڕینی کەر بوو ئەوا پەنا بگرن بە خوای گەورە لە شەیتان چونکە ئەو شەیتانی بینیووە.

٢٨- (إِذَا سَمِعْتُمُ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ، ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلَاةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْرًا، ثُمَّ سَلُوا اللَّهَ لِيَ الْوَسِيلَةَ فَإِنَّهَا مَنْزِلَةٌ فِي الْجَنَّةِ لَا تَنْبَغِي إِلَّا لِعَبْدٍ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ، فَمَنْ سَأَلَ لِيَ الْوَسِيلَةَ حَلَّتْ عَلَيْهِ الشَّفَاعَةُ)

.

واتە: ئەگەر گوێتان لە بانگدەر بوو ئەوا وەکو ئەو بڵێن پاشان سەڵاواتم لەسەر بدەن، چونکە هەرکەسێك تەنها یەکجار سەڵاواتم لەسەر بدات ئەوا خوای گەورە دە جار سەڵاواتی لەسەر دەدات، پاشان داوا بکەن لە خوای گەورە کە وەسیلەم پێ بخەشێت کە شوێنێکە لەبەهەشت بۆ هیچ کەسێك نابێت تەنها بۆ

بەندەیەك لەبەندەكانی خـوا نـەبێت، وە بـە ئومێـدم كـە ئـەو بەندەیـە مـن بم، جـا هەركەسێك داوای وەسیلەم بۆ بكات ئەوا شەفاعەتی منی بە قسمەت دەبێت.

٢٩- (إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلَا يَبْصُقْ بَيْنَ يَدَيْهِ وَلَا عَنْ يَمِينِهِ وَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ).

واتە: ئەگەر یەكێك لە ئێوە نوێژی كرد با تـف نـەكات لـە پـێش خـۆی یـان لای ڕاستی بەڵكو با تف بكاتە لای چەپی یان ژێر پێی.

٣٠- (إِذَا عَادَ الرَّجُلُ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ يَعُودُهُ مَشَى فِي خِرَافَةِ الْجَنَّةِ حَتَّى يَجْلِسَ، فَإِذَا جَلَسَ غَمَرَتْهُ الرَّحْمَةُ، فَإِنْ كَانَ غُدْوَةً صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنْ كَانَ عَشِيًّا صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُصْبِحَ) .

واتە: ئەگەر پیاو سەردانی برای موسڵمانی بكـات ئـەوا لـە باخـەكانی بەهەشـت بـەروبوم لـێ دەكاتـەوە تـا دادەنیشـێت، وە ئەگـەر دانیشـت ڕەحمـەتی خـوا دایدەپۆشێت، وە ئەگەر بەبەیانی سەردانی بكات ئەوا حەفتا هەزار فریشتە دوعـای خێری بۆ دەكەن تا ئێوارە دەكاتەوە، وە ئەگەر ئێوارە سەردانی بكات ئەوا حەفتا هەزار فریشتە دوعای خێری بۆ دەكات تا بەیانی دەكاتەوە.

٣١- (إِذَا عُمِلَتِ الْخَطِيئَةُ فِي الْأَرْضِ كَانَ مَنْ شَهِدَهَا فَكَرِهَهَا كَانَ كَمَنْ غَابَ عَنْهَا، وَمَنْ غَابَ عَنْهَا فَرَضِيَهَا كَانَ كَمَنْ شَهِدَهَا) .

واتە: ئەگەر تاوان لەسەر زەوی کرا ئەوەی کە ئاگاداری بێت و پێی ناخۆش بێت وەکو ئەوە وایە کە لەوێ نەبووبێت، وە ئەوەی لەوێ نەبووبێت بەڵام ڕازی بێت بەو تاوانە ئەوە وەکو ئەوە وایە کە ئامادەی بوو بێت.

٣٢- (إذا فَزِعَ أحَدُكُمْ مِنَ النَّومِ فَلْيَقُلْ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ مِنْ غَضَبِهِ وَعِقَابِهِ وَشَرِّ عِبَادِهِ، وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ وَأَنْ يَحْضُرُونِ، فَإِنَّهَا لَنْ تَضُرَّهُ) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە لە خەودا ترسا ئەوا بابڵێت: پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خوای گەورە (قورئانی پیرۆز) لە توڕە بوونی خوای گەورەو سزاکەی وە لەشەڕ و خراپەی بەندەکانی وە لەوەسوەسەی شەیتان وە لە ئامادە بونیان، ئەو کاتە شەیتان زیانی پێ ناگەیەنێت.

٣٣- (إذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنَ اللَّيْلِ فَأَرَادَ أنْ يَتَوَضَّأَ فَلَا يُدْخِلْ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ حَتَّى يَغْسِلَهَا، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ، وَلَا على مَا وَضَعَهَا) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە لەخەو هەستا ویستی دەست نوێژ بشوات با دەستی نەخاتە نێو قاپەکەیەوە تا دەیشۆرێت، چونکە ئەو نازانێت شەو دەستی لە کوێ بووە وە دەستی بەر چی کەوتووە.

٣٤- (إِذَا قَرَأَ ابْنُ آدَمَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ اعْتَزَلَ الشَّيْطَانُ يَبْكِي يَقُولُ: يَا وَيْلَه أُمِرَ ابْنُ آدَمَ بِالسُّجُودِ فَسَجَدَ فَلَهُ الْجَنَّةُ، وَأُمِرْتُ بِالسُّجُودِ فَعَصَيْتُ فَلِيَ النَّارُ ) .

واتە: ئەگەر ئادەمیزاد ئایەتی سەجدە بخوێنێت و سەجدە ببات ئەوا شـەیتان دوور دەکەوێتەوەو دەگری و دەڵێت: هاوار بۆ خۆم ئادەمیزاد فەرمانی پێ بکرا بـە سوجدە بردن و سوجدەی برد و بەهەشتی بۆ هەیـە، وە مـن فـەرمانم پـێ کـرا بـە سوجدە بردن و سەرپێچی خوام کردو دۆزەخم بۆ هەیە.

٣٥- (إِذَا نَزَلَ أَحَدُكُمْ مَنْزِلًا فَلْيَقُلْ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شرِّ مَا خَلَقَ، فَإِنَّهُ لَا يَضُرُّهُ شيءٌ حَتَّى يَرْتَحِلَ عَنْهُ) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە لەشوێنێك لایداو دابەزی بـا بڵێـت: پـەنا دەگـرم بـە وشە تـەواوەکانی خـوای گـەورە (قورئـانی پـیرۆز) لـە شـەڕو خراپـەی ئـەوەی کـە دروستی کردووە، ئەو کاتە هیچ شتێك زیانی پێ ناگەیەنێت تا لـەو شـوێنە دەڕوات و بەجێی دەهێڵێت.

٣٦- (إذا وَقَـعَ الـذُّبابُ فِي شَـرَابِ أحَـدِكُمُ فَلْيَغْمِسْـهُ ثُمَّ لْيَنْتَزِعْـهُ، فَإِنَّ فِي إِحْـدَى جَنَاحَيهِ دَاءٌ، وَفِي الأُخْرَى شِفَاءٌ) .

واتە: ئەگەر مێش کەوتە ناو خواردنـەوەی یـەکێك لـە ئێـوەوە ئـەوا بـا نقـومی بکـات پاشـان دەری بکـات و فڕێـی بـدات، چـونکە لـە ژێـر یـەکێك لـە باڵەکانیـدا نەخۆشی هەیەو لەژێر بەڵەکەی تریدا شیفا هەیە.

٣٧- (أرْبَعٌ إذا كُنَّ فِيكَ فَلا عَلَيكَ مَا فَاتَكَ مِنَ الدُّنيا: صِدْقُ حَدِيثٍ، وَحِفْظُ أَمَانَةٍ، وَحُسْنُ خُلُقٍ، وَعِفَّةُ مَطْعَمٍ) .

واتە: چوار ڕەوشت هەن ئەگەر تێتدا بێت ئەوا هیچ زیانێکت لێ ناکەوێت ئەوەی کە لە دونیا لەدەستت بچێت: ڕاستگۆیی لە قسە کردندا، و پاراستنی ئەمانەت، و ڕەوشت جوانی، و حەڵاڵی خواردن.

٣٨- (أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا خَالِصًا، وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ حَتَّى يَدَعَهَا: إِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ، وَإِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وَإِذا خَاصَمَ فَجَرَ) .

واتە: چوار ڕەوشت هەیە لەهەر کەسێکدا هەبێت ئەوا دووڕوویەکی تەواوە، وە هەرکەسێك یەك ڕەوشتی تێدا بێت ئەوا ڕەوشتێکی دوو ڕوویی تێدایە تا وازی لێ دێنێت: ئەگەر ئەمانەتی لا دانرا ناپاکی لێ دەکات، وە ئەگەر قسە بکات درۆ ئەکات، وە ئەگەر پەیمان بدات غەدر ئەکات، وە ئەگەر لەگەڵ کەسێکدا ڕووبەڕوو بێتەوەو کێشەی هەبێت خراپەکاری دەکات.

٣٩- (إِنْ أَحْبَبْتُمْ أَنْ يُحِبَّكُمُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَرَسُولَهُ، فَأَدُّوا إِذَا ائْتُمِنْتُمْ، وَاصْدُقُوا إِذَا حَدَّثْتُمْ، وَأَحْسِنُوا جِوَارَ مَنْ جَاوَرَكُمْ).

واتە: ئەگەر پێتان خۆشە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ خۆشتانی بوێت ئەوا: ئەگەر ئەمانەتتان لەلا دانرا بیدەنەوە، وە ئەگەر قسەتان کرد ڕاست بڵێن، وە هاوسێی هەرکەسێك بوون ئەوا بە چاکی هاوسێتیان بکەن.

٤٠- (أَنَا زَعِيمٌ بِبَيْتٍ فِي رَبَضِ الْجَنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ الْمِرَاءَ وَإِنْ كَانَ مُحِقًّا، وَبِبَيْتٍ فِي وَسَطِ الْجَنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ الْكَذِبَ وَإِنْ كَانَ مَازِحًا، وَبِبَيْتٍ فِي أَعْلَى الْجَنَّةِ لِمَنْ حَسُنَ خُلُقُهُ)

واتە: من کەفیلی ماڵێکم لە دەورەبەری بەهەشت بۆ کەسێك کەواز لە دەمەقاڵێ و مشتومڕ بهێنێت ئەگەر لەسەر حەقیش بوو، وە بە ماڵێك لە ناوەڕاستی بەهەشت بۆ کەسێك کەواز لە درۆ کردن بهێنێت ئەگەر بەگاڵتەیشی بێت، وە بەماڵێك لەبەرزترینی بەهەشت بۆ کەسێك کە ڕەوشتی جوان بێت.

٤١- (إِنَّ أَحَبَّكُمْ إِلَيَّ, وَأَقْرَبَكُمْ مِنِّي فِي الْآخِرَةِ مَجَالِس: أَحَاسِنُكُمْ أَخْلَاقًا, وَإِنَّ أَبْغَضَكُمْ إِلَيَّ, وأبْعَدَكُمْ مِنِّي في الآخِرَةِ: أَسْوَأُكُمْ أخْلاقاً) .

واتە: بەڕاستی خۆشەویستترین کەستان لە لای من وە نزیکترینتان لە دانیشتی من لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو کەسانەن کە ڕەوشتیان جوانترینە، وە بەڕاستی لە هەموو کەس زیاتر ڕقم لێ بێت و لەڕۆژی قیامەتدا لەمن دوور بن ئەوانەن کە ڕەوشتیان خراپترینە.

٤٢- (إنّ الأشْعَرِيّينَ إذا أرْمَلُوا في الغَزْو، أوْ قَلَّ طَعَامُ عِيالِهِمْ بِالمَدِيْنَةِ؛ جَمَعُوا مَا كَانَ عِنْدَهُمْ في ثَوْبٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ اقْتَسَمُوهُ بَيْنَهُم في إناءٍ وَاحِدٍ بالسَّوِيَّةِ، فَهُمْ مِنِّي وَأنَا مِنْهُمْ ) .

واتە: بەڕاستی ئەشعەرییەکان ئەگەر لەکاتی غەزا کردندا خواردنیان تەواو بوایە، یان خواردنی منداڵەکانیان لە مەدینە کەمی بکردایە، ئەو خواردنەی هەیانبوایە ئەیانکردە ناو پۆشاکێکەوە پاشان لەناو قاپێکدا لە نێوان خۆیاندا بەیەکسانی دابەشیان دەکرد، بۆیە ئەوان لە منن، وە منیش لەوانم.

٤٣- (اضْمَنُوا لِي سِتًّا مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَضْمَنُ لَكُمُ الجَنَّةَ: اصْدُقُوا إِذَا حَدَّثْتُمْ، وَأَوْفُوا إِذَا وَعَدْتُمْ، وأدُّوا إِذا اؤتُمِنْتُمْ، وَاحْفَظُوا فُرُوجَكُمْ، وَغُضُّوا أبْصَارَكُمْ، وَكُفُّوا أَيْدِيَكُمْ) .

واتە: لە گیانی خۆتاندا شەش شتم بۆ مسۆگەر بکەن منیش بەهەشتتان بۆ مسۆگەر ئەکەم: ئەگەر قسەتان کرد ڕاست بکەن، وە ئەگەر بەڵێنتاندا بیبەنە سەر، وە ئەگەر سپاردەتان لەلا دانرا بیپارێزن و بیدەنەوە، وە داوێنتان بپارێزن، وە چاوتان بپۆشن لە حەرام، وە دەستتان بپارێزن لە حەرام.

٤٤- (أُعْبُدِ اللهَ كَأنَّكَ تَرَاهُ فَإنَّكَ إنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإنَّهُ يَرَاكَ، وَاحْسِبْ نَفْسَكَ مَعَ المَوْتَى، وَاتَّقِ دَعْوَةَ المَظْلُومِ فَإِنَّهَا مُسْتَجَابَةٌ).

واتە: خوا بپەرستە هەر وەکو ئەوەی کە دەیبینی وە ئەگەر تۆ ئەو نابینی ئەوا ئەو تۆ دەبینێت، وە خۆت بژمێرە لە مردووەکان، وە خۆت بپارێزە لە دوعای ستەم لێکراو چونکە وەڵام دەدرێتەوە.

٤٥- (اغْتَنِمْ خَمْسًا قَبْلَ خَمْسٍ: حَيَاتَكَ قَبْلَ مَوْتِكَ، وَصِحَّتَكَ قَبْلَ سَقَمِكَ، وَفَرَاغَكَ قَبْلَ شُغْلِكَ، وَشَبَابَكَ قَبْلَ هَرَمِكَ، وَغِنَاكَ قَبْلَ فَقْرِكَ) .

واتە: پێنج شت بقۆزەرەوە پێش پێنج شت: ژیانت پێش مردنت، وە لەش ساغیت پێش نەخۆشیت، وە دەست بەتاڵیت پێش سەرقاڵیت، وە گەنجێتیت پێش پیریت، وە دەوڵەمەندیت پێش هەژاریت.

٤٦- (أُطْلُبُوا لَيْلَةَ القَدْرِ فِي العَشْرِ الأواخِرِ مِنْ رَمَضَانَ) .

واتە: بەدوای شەوی قەدردا بگەڕێن لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان.

٤٧- (اقْرَءُوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَفِيعًا لِأَصْحَابِهِ، اقْرَءُوا الزَّهْرَاوَيْنِ: الْبَقَرَةَ، وَسُورَةَ آلِ عِمْرَانَ، فَإِنَّهُمَا تَأْتِيَانِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَنَّهُمَا غَمَامَتَانِ، أَوْ كَأَنَّهُمَا غَيَايَتَانِ، أَو فِرْقَانِ مِنْ طَيْرٍ صَوَافَّ، تُحَاجَّانِ عَنْ أَصْحَابِهِمَا، اقْرَءُوا سُورَةَ الْبَقَرَةِ، فَإِنَّ أَخْذَهَا بَرَكَةٌ، وَتَرْكَهَا حَسْرَةٌ، وَلَا تَسْتَطِيعُهَا البَطَلَةُ) .

واتە: قورئان بخوێنن، چونکە بەڕاستی لە ڕۆژی قیامەتدا تکا بۆ خاوەنەکەی دەکات، هەردوو گوڵەکە بخوێنن: سورەتی بەقەرەو ئالی عیمران، ئەوان لەڕۆژی

قیامەتدا دێن وەکو دوو هەور، یان وەکو دوو تیشکی ڕووناکی خۆر، یان وەك دوو کۆمەڵ لە باڵندەی باڵگراوە بەرگری دەکەن لە خاوەنەکانیان، سورەتی بەقەرە بخوێنن، چونکە وەرگرتنی بەرەکەتەو، وازهێنان لێی پەشیمانییەو، لە توانای جادوو گەرەکانیشدا نیە.

٤٨- ( اقْرَءُوا الْقُرْآنَ وَاعْمَلُوا بِهِ، وَلا تَجْفُوا عَنْهُ، وَلا تَغْلُوا فِيهِ، وَلا تَأْكُلُوا بِهِ، وَلا تَسْتَكْثِرُوا بِهِ).

واتە: قورئان بخوێنن وە کاری پێ بکەن، و کەمتەرخەمی تێدا مەکەن، و زیادەڕەویشی تێدا مەکەن، وە پارەی پێ پەیدا مەکەن، وە مەیکەنە هۆکارێك بۆ زیادکردنی دونیا.

٤٩- (أَكْثِرُوا الصَّلاَةَ عَلَيَّ؛ فإنَّ اللهَ وَكَّلَ بِي مَلَكاً عِنْدَ قَبرِي فَإذا صَلَّى عَلَيَّ رَجُلٌ مِنْ أُمَّتِي قَالَ لِي ذَلكَ المَلَكُ: يَا مُحَمَّدُ إنَّ فُلانَ بْنَ فُلانٍ صَلَّى عَلَيكَ السَّاعَةَ) .

واتە: زۆر سەڵاوات لەسەرم بدەن، چونکە بەڕاستی خوای گەورە فریشتەیەکی لەلای گۆڕەکەم پێ سپاردوم ئەگەر هەرکەسێك لە ئوممەتەکەم سەڵاواتم لەسەر بدات ئەو فریشتەیە پێم ئەڵێت ئەی محمد فلانی کوڕی فلان لەم کاتەدا سەڵاواتی لەسەرت دا.

٥٠- (أَكْمَلُ المُؤمِنينَ إيماناً أحَاسِنُهُمْ أخْلاقاً، الْمُوَطَّؤُونَ أَكْنَافًا ، الذِينَ يَأْلَفُونَ ويُؤْلَفُونَ، وَلا خَيرَ فِيمَنْ لا يَأْلَفُ وَلا يُؤْلَفْ).

واتە: لە هەموو باوەڕدارێك باوەڕەكەی تەواوتر ئەو كەسەیە كە ڕەوشتی لە هەمووی جوانتر بێت، نەرمونیان بێت خەڵكی خۆشی بوێت و ئەویش خەڵكی خۆش بوێت، وە خێر لە كەسێكدا نیە كە خەڵكی خۆشیان نەوێت و ئەویش خەڵكی خۆش نەوێت.

٥١- (إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ) .

واتە: خوای گەورە چاكەی لەسەر هەموو شتێك نوسیوە، ئەگەر شتێكتان كوشت ئەوا بە چاكی بیكوژن، وە ئەگەر شتێكتان سەربڕی ئەوا بە چاكی سەری ببڕن، با یەكێكتان چەقۆكەی تیژ بكات و سەربڕاوەكە پشو پێ بدات و ئازاری نەدات.

٥٢- ( إِنَّ اللَّهَ يَقْبَلُ الصَّدَقَةَ وَيَأْخُذُهَا بِيَمِينِهِ فَيُرَبِّيهَا لِأَحَدِكُمْ كَمَا يُرَبِّي أَحَدُكُمْ مُهْرَهُ، حَتَّى إِنَّ اللُّقْمَةَ لَتَصِيرُ مِثْلَ أُحُدٍ ).

واتە: خوای گەورە خێر قـەبوڵ دەكـات و بەدەسـتی ڕاسـتی وەری دەگرێـتو پەروەردەی دەكات وەكـو چـۆن یـەكێك لـە ئێـوە بێچـویەك پـەروەردە دەكـات تـا پارووپەك وەكو كێوی ئوحودی لیٚ دێت.

٥٣- (إِنَّ اللَّهَ تَعَـالَى يَقُـولُ: يَا ابْـنَ آدَمَ تَفَـرَّغْ لِعِبَـادَتِي أَمْـلَأْ صَـدْرَكَ غِـنًى، وأَسُـدُّ فَقْرَكَ، وَإِنْ لَا تَفْعَلْ مَلَأْتُ يَدَكَ شُغْلًا، وَلَمْ أَسُدَّ فَقْرَكَ ) .

واتە: خـوای گـەورە دەفـەرمێت: ئـەی ئـادەمیزاد خـۆت یـەكلا بكـەرەوە بـۆ پەرستنی من دڵت پـڕ لـە دەوڵەمەنـدی دەكـەم و هەژارییەكەیشـت نـاهێڵم، ئەگـەر وانەكەیت ئەوا دەستت پڕ لە سەرقاڵی دەكەم و هەژارییەكەیشت پڕ ناكەمەوە.

٥٤- (إِنَّ اللهَ تَعَالى يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: يَا ابْنَ آدَمَ مَرِضْتُ فَلَمْ تَعُدْنِي قَالَ: يَا رَبِّ كَيْفَ أَعُودُكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟ قَالَ: أَمَّا عَلِمْتَ أَنَّ عَبْدِي فُلَانًا مَرِضَ فَلَمْ تَعُدْهُ؟ أَمَا عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْ عُدْتَهُ لَوَجَدْتَنِي عِنْدَهُ؟ يَا ابْنَ آدَمَ اسْتَطْعَمْتُكَ فَلَمْ تُطْعِمْنِي قَالَ: يَا رَبِّ كَيْفَ أُطْعِمُكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟ قَالَ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّهُ اسْتَطْعَمَكَ عَبْدِي فُلَانٌ فَلَمْ تُطْعِمْهُ؟ أَمَا عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْ أَطْعَمْتَهُ لَوَجَدْتَ ذَلِكَ عِنْدِي؟ يَا ابْنَ آدَمَ اسْتَسْقَيْتُكَ فَلَمْ تَسْقِنِي قَالَ: يَا رَبِّ كَيْفَ أَسْقِيكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟ قَالَ: اسْتَسْقَاكَ عَبْدِي فُلَانٌ فَلَمْ تَسْقِهِ أما إِنَّك لَو سَقَيتَهُ لَوَجَدْتَ ذَلِك عِنْدِي) .

واتە: خـوای گـەورە لـە ڕۆژی قیامەتـدا دەفـەرمێت: ئـەی ئـادەمیزاد نـەخۆش کەوتم سەردانت نەکردم ئەویش دەڵێت: ئەی پەروەردگارم چۆن سەردانت بکەم کە تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانی؟! خوای گەورە دەفـەرمێت: ئـەی نـەتزانی فلاَنـە بەندەی من نەخۆش بوو سەردانت نەکرد ئایا نازانی ئەگەر سـەردانت بکردایـە ئـەوا منت لای ئەو دەبینی، ئـەی ئـادەمیزاد مـن داوای خـواردنم لێـت کـرد پێمـت نـەدا، ئەویش دەڵێت: ئەی پەروەردگار چۆن خواردن بە تـۆ بـدەم کـە تـۆ پـەروەردگاری هەموو جیهانیانی؟! خوای گەورە دەفەرمێت: ئایا نازانی فلاَنە بەنـدەی مـن داوای خواردنی لێ کردیت خواردنت پێ نەدا ئایا نازانیت ئەگەر خواردنت پێی بدایـە ئـەوا ئەوەت لەلای من ئەبینی، ئەی ئادەمیزاد داوای ئـاوم لـێ کردیـت ئـاوت پـێ نـەدام ئەویش دەڵێت: ئەی پەروەردگار چۆن ئاوت پێ بدەم کە تۆ پـەروەردگاری هـەموو جیهانیانی؟! خوای گەورەیش دەفەرمێت: فلاَنە بەندەم داوای ئاوی لێ کردی پێت نەدا بەلاَم ئەگەر تۆ ئاوت پێی بدایە ئەوا ئەو شتەت لە لای من دەبینی.

٥٥- (إنَّ النَّاسَ إذا رَأَوا المُنْكَرَ وَلا يُغَيِّرُونَهُ أوشَكَ أنْ يَعُمَّهُمُ اللهُ بِعِقابِهِ ) .

واتە: ئەگەر خەڵکی خراپەکاری ببینن و نەیگۆڕن ئەوا نزیکە کە خـوای گـەورە سزاکەی گشتگیر بکات بەسەر هەموو خەڵکیدا.

٥٦- (إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ عَمَلِهِ الصَّلَاةُ، فَإِنْ صَلَحَتْ فَقَدْ أَفْلَحَ وأَنْجَحَ، وَإِنْ فَسَدَتْ فَقَدْ خَابَ وَخَسِرَ، فَإِنِ انْتَقَصَ مِنْ فَرِيضَتِهِ شَيْءٌ قَالَ الرَّبُّ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: انْظُرُوا هَلْ لِعَبْدِي مِنْ تَطَوُّعٍ؟ فَيُكَمَّلُ بِهَا مَا انْتَقَصَ مِنَ الْفَرِيضَةِ ثُمَّ يَكُونُ سَائِرُ عَمَلِهِ عَلَى ذَلِكَ ) .

واتە: یەکەم شت کە بەندە لەڕۆژی قیامەتدا لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت لە کردەوەکانی نوێژە، ئەگەر نوێژ کردنەکەی چاك بووبێت ئەوا سەرفرازو سەرکەوتوو دەبێت، وە ئەگەر نوێژەکەی خراپ بێت ئەوا زەرەرمەندو خەسارەتمەند دەبێت، وە ئەگەر کەمووکوڕی لەفەرزێکدا هەبووبێت ئەوا خوای گەورە دەفەرمێت: تەماشا بکەن بزانن بەندەکەم نوێژی سوننەتی هەیە تا فەرزەکانی بۆ پڕ بکرێتەوە، پاشان تێکڕای کردەوەکانی بەم شێوەیە دەبێت.

٥٧- (إِنَّ أَهْلَ النَّارِ لَيَبْكُونَ حَتَّى لَو أُجْرِيتِ السُّفُنُ فِي دُمُوعِهِمْ جَرَتْ، وَإِنَّهُمْ لَيَبْكُونَ الدَّمَ).

واتە: خەڵکی ئاگری دۆزەخ دەگرین تا ئەگەر کەشتی لەناو فرمێسکەکانیاندا بێت دەڕوات، وە ئەوان فرمێسکیان خوێنەو خوێن دەڕێژن.

٥٨- (إِنَّ مِنَ إِجْلَالِ اللَّهِ إِكْرَامَ ذِي الشَّيْبَةِ الْمُسْلِمِ، وَحَامِلَ الْقُرْآنِ غَيْرِ الْغَالِي فِيهِ، وَالْجَافِي عَنْهُ، وَإِكْرَامَ ذِي السُّلْطَانِ الْمُقْسِطِ) .

واتە: لەبەڕێز گرتنی خوای گەورە: ڕێز گرتنی بەساڵاچویەکی موسڵمانە، وە ڕێز گرتنە لە هەڵگری قورئان کە زیادەڕەوی و کەمتەرخەمی تێدا نەکات، وەڕێز گرتنە لە فەرمانڕەوایەکی دادپەروەر.

٥٩- (مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الأُتْرُجَّة رِيحُهَا طيِّبٌ وَطَعْمُهَا طيِّبٌ، وَمَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ التَّمْرَةِ لَا رِيحَ لَهَا وَطَعْمُهَا حلو، وَمَثَلُ الْفَاجِرِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الرَّيْحَانَةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ، وَمَثَلُ الْفَاجِرِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْحَنْظَلَةِ طَعْمُهَا مُرٌّ وَلَا رِيحَ لها) .

واتە: نمونەی ئەو باوەڕدارەی کە قورئان دەخوێنێت وەکو شەمامە وایە (کاڵەکی زەردی بچوك) بۆنی خۆشەو تامی خۆشە، وە نمونەی ئەو باوەڕدارەی کە قورئان ناخوێنێت وەکو خورمایەو بۆنی نیە بەڵام تامی شیرینە، وە نمونەی خراپەکار کە قورئان دەخوێنێت وەکو ڕیحانەیە بۆنی خۆشە بەڵام تامی تاڵە، وە نمونەی خراپەکار کە قورئان ناخوێنێت وەکو گوژاڵك وایە تامی تاڵەو بۆنی نیە.

٦٠- (رِبَاطُ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ خَيْرٌ مِنْ صِيَامِ شَهْرٍ وَقِيَامِهِ، وَإِنْ مَاتَ فِيهِ جَرَى عَلَيْهِ عَمَلُهُ الَّذِي كَانَ يَعْمَلُه، وَأُجْرِيَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ، وَأَمِنَ مِنَ الفَتَّانَ) .

واتە: پاسەوانی کردن لەشەو و ڕۆژێکدا لەبەرامبەر دوژمندا بۆ خوا باشترە لە مانگێك کە بەڕۆژ بەڕۆژوو بیت و بەشەو شەونوێژ بکەیت، وە ئەگەر لە پاسەوانیدا

بمریت ئەوا ئەو کردەوە چاکانەی کە دەیکرد خێری هەمووی بۆ دەچێت وە ڕۆزی بۆ دەچێت وە ئەمین و پارێزراو دەبێت لە فیتنەو تاقیکردنەوەی ناو گۆڕ.

٦١- (لِلشَّهِيدِ عِنْدَ اللهِ سَبْعُ خِصالٍ:

١- يَغْفِرُ لَهُ فِي أَوَّلِ دَفْعَةٍ مِنْ دَمِهِ.

٢- وَيَرَى مَقْعَدَهُ مِنَ الجَنَّةِ.

٣- وَيُجَارُ مِنْ عَذابِ القَبْرِ .

٤- وَيَأْمَنُ مِنَ الفَزَعِ الأَكْبَرِ .

٥- وَيُوضَعُ عَلى رَأْسِهِ تَاجُ الوَقارِ اليَاقُوتَةُ مِنْهُ خَيرٌ مِنَ الدُّنْيا وَمَا فِيهَا.

٦- وَيُزَوَّجُ ثِنَتَينِ وَسَبْعينَ مِنَ الحُورِ العِينِ.

٧- وَيَشْفَعُ فِي سَبعينَ مِنْ أَقَارِبِهِ) .

واتە: شەهید لە لای خوای گەورە حەوت تایبەتمەندێتی هەیە:

١- لەگەڵ یەکەم دڵۆپە خوێنی کە لە گیانی دەردەچێت خوا لە هەموو تاوانەکانی خۆش دەبێت.

٢- شوێنی خۆی لەبەهەشت دەبینێت.

٣- لە سزای ناو گۆڕ پارێزراو دەبێت.

٤- لە ترسە هەرە گەورەکە ئەمین و پارێزراو دەبێت.

٥- تـاجی ڕێـز دەکرێتـە سـەری یـاقوتێکی باشـترە لـە دونیـاو هەرچـی لـە دونیایشدا هەیە.

٦- حەفتاو دوو حۆری پێ دەدرێت.

٧- شەفاعەت بۆ حەفتا لە خزم و کەسە نزیکەکانی دەکات.

# قۆناغی دەیەم

١- (إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ قُبِضَ، وَفِيهِ النَّفْخَةُ، وفِيهِ الصَّعْقَةُ، فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلَاةِ ) .

واتە: بەڕاستی باشترین ڕۆژەکانتان ڕۆژی هەینی یە، لەو ڕۆژەدا ئادەم دروست کرا، وە هەر لەو ڕۆژەدا گیانی کێشرا، وە هەر لەو ڕۆژەدا قیامەت هەڵدەسێت، وە هەر لەو ڕۆژەدا خەڵکی زیندوو دەکرێنەوە، بۆیە لەو ڕۆژەدا زۆر سەڵاوات لەسەرم بدەن.

٢- ( إِنَّ مِنْ النَّاسِ نَاسَاً مَفَاتِيحَ لِلْخَيْرِ مَغَالِيقَ لِلشَّرِّ، وَإِنَّ مِنْ النَّاسِ نَاسَاً مَفَاتِيحَ لِلشَّرِّ مَغَالِيقَ لِلْخَيْرِ، فَطُوبَى لِمَنْ جَعَلَ اللَّهُ مَفَاتِيحَ الْخَيْرِ عَلَى يَدَيْهِ، وَوَيْلٌ لِمَنْ جَعَلَ اللَّهُ مَفَاتِيحَ الشَّرِّ عَلَى يَدَيْهِ).

واتە: بەڕاستی لەناو خەڵکیدا هەیە کلیلی خێرو چاکەیە داخەری شەڕو خراپەیە، وە بەڕاستی لەناو خەڵکیدا هەیە کلیکلی شەڕو خراپەیەو داخەری خێرو چاکەیە، جا بەختەوەری و بەهەشت بۆ ئەو کەسانەی کە خوای گەورە کلیلی خێری داوەتە دەستیان، وە هەڕەشەو دۆزەخ بۆ ئەو کەسانەی کە خوای گەورە کلیلی شەڕو خراپەی داوەتە دەستیان.

٣- (إِنَّ مِمَّا يَلْحَقُ الْمُؤْمِنَ مِنْ عَمَلِهِ وَحَسَنَاتِهِ بَعْدَ مَوْتِهِ عِلْمًا نَشَرَهُ، وَوَلَداً صَالِحاً تَرَكَهُ، وَمُصْحَفاً وَرَّثَهُ، أَوْ مَسْجِدًا بَنَاهُ، أَوْ بَيْتًا لِابْنِ السَّبِيلِ بَنَاهُ، أَوْ نَهْرًا أَجْرَاهُ، أَوْ صَدَقَةً أَخْرَجَهَا مِنْ مَالِهِ فِي صِحَّتِهِ وَحَياتِهِ تَلْحَقُهُ مِنْ بَعْدِ مَوتِهِ) .

واته: بەڕاستی ئەوەی کە بەباوەڕدار دەگات لە کردەوەو چاکەکانی لەپاش مردنی: زانیارییەکە کە بڵاوی کردبێتەوە، وە منداڵێکی چاکە کە بەجێی هێشتبێ، وە قورئانێکە کە جێی هێشتبێ، یان مزگەوتێکی دروست کردبێت، یان ماڵێکی بۆ ڕێبواران دروست کردبێت، یان بیرو ڕوبارێکی کردبێت، یان خێرێك لە ماڵی خۆی دەری کردبێت لەکاتی لەش ساغی و ژیانی خۆیدا لە پاش مردنی ئەمانەی پێ دەگات.

٤- (إِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالكَلِمَةِ مِنْ رِضْوَانِ اللهِ تَعَالَى مَا كَانَ يَظُنُّ أنْ تَبْلُغَ مَا بَلَغَتْ، يَكْتُبُ اللهُ لَهُ بِهَا رِضْوَانَهُ إِلَى يَومِ القِيامَةِ، وإنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالكَلِمَةِ مِنْ سَخَطِ اللهِ مَا يَظُنُّ أنْ تَبْلُغَ مَا بَلَغَتْ يَكْتُبُ الله لَهُ بِهَا سَخَطَهُ إِلَى يَوْمِ القِيامَةِ) .

واته: بەڕاستی پیاوی واهەیە قسەیەك دەكات لە ڕەزامەندی خوای گەورەدا گومان نابات ئەوەندە بەرز بێتەوە بەهۆیەوە خوای گەورە ڕەزامەندی خۆی بۆ دەنوسێت تا ڕۆژی قیامەت، وە بەڕاستی پیاوی وا هەیە قسەیەك دەكات لە تورە بوونی خوای گەورەدا گومان نابات لای خودا ئەوەندە خراپ بێت بەهۆیەوە خوای گەورە تورەبوونی خۆی بۆ دەنوسێت تا ڕۆژی قیامەت.

٥- (إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا قَامَ يُصَلِّي أُتِيَ بِذُنُوبِهِ كِلِّهَا فَوُضِعَتْ عَلَى رَأْسِهِ وعَاتِقَيهِ فَكُلَّمَا رَكَعَ أَوْ سَجَدَ تَسَاقَطَتْ عَنْهُ) .

واتە: بەڕاستی کاتێك بەندە ڕادەوەستێت نوێژ دەکات هەموو تاوانەکانی دەهێنرێت دەخرێتە سەر سەرو شانەکانی هەرکاتێك دەچێتە رکوعو سجود تاوانەکانی لێ بەر دەبێتەوەو هەڵدەوەرێت.

٦- (إِنَّ الْقَبْرَ أَوَّلُ مَنْزِلٍ مِنْ مَنَازِلِ الْآخِرَةِ، فَإِنْ نَجَا مِنْهُ فَمَا بَعْدَهُ أَيْسَرُ مِنْهُ، وَإِنْ لَمْ يَنْجُ مِنْهُ فَمَا بَعْدَهُ أَشَدُّ مِنْهُ) .

واتە: بەڕاستی قەبر یەکەم شوێنی ڕۆژی دواییە، ئەگەر مرۆڤ لەوێ ڕزگاری بێت ئەوا شوێنەکانی دواتر ئاسانترن لەوێ، وە ئەگەر لەوێ ڕزگاری نەبێت ئەوا شوێنەکانی دواتر سەختترن لەوێ.

٧- (إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَيْكُمْ عُقُوقَ الْأُمَّهَاتِ، وَوَأْدَ الْبَنَاتِ، وَمَنْعًا وَهَاتِ. وَكَرِهَ لَكُمْ قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ) .

واتە: بەڕاستی خوای گەورە لەسەرتانی حەرام کردووە: ئازاردانی دایکان، وە زیندەبەچاڵ کردنی کچان، وە نەدانی ئەوەی کە فەرمانی پێ کراوە بەبەخشینی وە داواکردنی ئەوەی کە شایانی نیە، وە پێی ناخۆشە بۆ ئێوە: وتراو دەڵێت: وە زۆری پرسیار کردن، و فەوتاندن و بەفیڕۆ دانی ماڵ.

٨- (إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَالَ: مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ، وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ، وَمَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ، فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا، وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا، وَإِنْ سَأَلَنِي لَأُعْطِيَنَّهُ، وَلَئِنِ اسْتَعَاذَنِي لَأُعِيذَنَّهُ، وَمَا تَرَدَّدْتُ عَنْ شَيْءٍ أَنَا فَاعِلُهُ تَرَدُّدِي عَنْ نَفْسِ الْمُؤْمِنِ يَكْرَهُ الْمَوْتَ وَأَنَا أَكْرَهُ مُسَاءَتَهُ) .

واتە: بەڕاستی خوای گەورە دەفەرمێت: هەرکەسێك دژایەتی دۆست و خۆشەویستێکی من بکات ئەوا جەنگی لە دژ ڕادەگەیەنم، وە هیچ کاتێك بەندەکەم لە من نزیك نابێتەوە بەشتێك خۆشەویستتر لەلام لەوانەی کە فەرزم کردووە لەسەری، وە بەردەوام بەندەکەم لە من نزیك دەبێتەوە بە سوننەتەکان تا وای لێ دێت خۆشم دەوێت، وە کە خۆشیشم ویست دەبم بەو بیستنەی کە پێی دەبیستێت، وە بەو بینینەی کە پێی دەبینێت، وە بەو دەستەی کە پێی درێژی دەکات، وە بەو قاچەکەی کە پێی دەڕوات، وە ئەگەر پرسیارم لێ بکات بەدڵنیایی پێی دەبەخشم، وە ئەگەر پەنام پێ بگرێت پەنای دەدەم، وە لە هیچ شتێکدا موتەرەدد نەبووم کە کردبێتم وەکو ڕوح کێشانی باوەڕدار، ئەو مردنی پێ ناخۆشە منیش پێم ناخۆشە توشی شتێکی بکەم کە پێی ناخۆشە.

٩- ( إِنَّ هَاتَيْنِ الصَّلاَتَيْنِ –يَعْنِي صَلاَةَ الْعِشَاءِ وَالْفَجْرِ– مِنْ أَثْقَلِ الصَّلَوَاتِ عَلَى الْمُنَافِقِينَ. وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا. عَلَيكُمْ بالصَّفَّ الْمُقَدَّمِ فِإنَّهُ

مِثْلِ صَفِّ الْمَلاَئِكَةِ، وَلَوْ تَعْلَمُونَ فَضِيلَتَهُ لَابْتَدَرْتُمُوهُ، وَإِنَّ صَلاَةَ الرَّجُلِ مَعَ الرَّجُلِ أَزْكَى مِنْ صَلاَتِهِ وَحْدَهُ، وَصَلاَتُهُ مَعَ الرَّجُلَيْنِ أَزْكَى مِنْ صَلاَتِهِ مَعَ الرَّجُلِ، وَمَا كَثُرَ فَهُوَ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ.

واتە: ئـەم دوو نوێـژە واتـە: عیشـاو بـەیانی– لـە قورسـترین نوێـژن لەسـەر دووڕووەكـان وە ئەگـەر بـزانن چ فـەزڵێكیان هەیـە ئـەوا بـۆی دەهـاتن ئەگـەر بـە گاگۆڵكێ بوایە، بچنە ریزی پێشەوە ئەوە وەكو پـۆلی فریشـتەكان وایـە، وە ئەگـەر فەزڵیتان بزانیایە ئەوا پەلەتان بۆ دەكرد، وە نوێژی پیـاو لەگـەڵ پیـاودا باشـترەو پاكترە لە نوێژەكەی خۆی بە تەنها، وە نوێژ كـردن لەگـەڵ دوو پیـاودا پـاكترە لـە نوێژەكـەی لەگـەڵ یـەك پیـاودا، وە چـەندێك زیـاتر بێـت ئـەوا لای خـوای گـەورە خۆشەویستترە.

١٠- (إنا مَعْشَرَ الأنبياءِ أُمِرْنَا أنْ نُعَجِّلَ إفْطارَنَا، وَنُـؤَخِّرَ سُحُورَنَا، وَنضَعَ أيمانَنَا على شَمَائِلِنَا في الصَّلاةِ) .

واتە: ئێمەی گرۆی پێغەمبەران فەرمانمان پێ كـراوە كـە لـە ڕۆژوو شـكاندنمان پەلـە بكـەین وە پاششـێو كـردن دوا بخـەین، وە دەسـتی راسـتمان بخەینـە سـەر دەستی چەپمان لە نوێژدا.

١١- (أَوْثَقُ عُرَى الإِيمانِ المُوالاةُ فِي اللهِ، وَالمُعَادَاةُ فِي اللهِ، وَالحُبُّ فِي اللهِ، وَالبُغْضُ فِي اللهِ) .

واتە: پتەوتریت پەتی ئیمان بریتیە لە: سەرخستن و هاوکاری لەبەر خوا، وە دژایەتی لەبەر خوا، وە خۆشەویستی لەبەر خوا، وە ڕق لێ بوون لەبەر خوا.

١٢- (ألا أُخْبِرُكُمْ بِأَفْضَلَ مِنْ دَرَجَةِ الصِّيامِ وَالصَّلاةِ وَالصَّدَقَةِ؟ إِصْلاحُ ذاتِ البَيْنِ، فَإِنَّ فَسَادَ ذاتِ البَيْنِ هي الحَالِقَةُ) .

واتە: ئایا ئاگادارتان بکەمەوە لەباشتر لە پلەی بەرۆژوو بوون و نوێژو خێرکردن؟ چاکسازی نێوان خەڵکی، چونکە بەڕاستی تێکدانی نێوان خەڵکی ئەوە تاشەری دینە دین ناهێڵێت.

١٣- (أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى اللَّهِ وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ وَإِنْ أُمِّرَ عَلَيكُمْ عَبْدٌ حَبَشِيٌّ، فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ بَعْدِي فَسَيَرَى اخْتِلَافًا كَثِيراً، فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ تَمَسَّكُوا بِهَا وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الْأُمُورِ فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ) .

واتە: وەسێتتان بۆ دەکەم بەتەقوای خوای گەورە وە گوێ گرتن و گوێڕاڵی ئەگەر چی بەندەیەکی حەبەشیش کرا بەفەرمانڕەواتان، چونکە بەڕاستی ئەوەی لەپاش من بژێت لە ئێوە ئەوا جیاوازییەکی زۆر دەبینێت بۆیە دەست بگرن بە

سوننەتی من و سوننەتی خولەفای ڕاشدین کە هیدایەت دراو بوونەو لەسەر ڕێگای ڕاست بوونە، دەستی پێوە بگرن و قەپی پیا بکەن بە کەڵبەکانتان بەجوانی دەستی پێوە بگرن، وە ئاگادارتان دەکەمەوە لە کارە تازە داهێنراوەکانی دین، چونکە بەڕاستی هەموو کارێکی تازە لە دیندا بیدعەیە وە هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییە.

١٤- (أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرِ أَعْمَالِكُمْ وَأَزْكَاهَا عِنْدَ مَلِيكِكُمْ؟ وَأَرْفَعِهَا فِي دَرَجَاتِكُمْ؟ وَخَيْرٍ لَكُمْ مِنْ إِنْفَاقِ الذهبِ والوَرِقِ؟ وَخَيرٍ لَكُمْ مِنْ أَنْ تَلْقَوْا عَدُوَّكُمْ فَتَضْرِبُوا أَعْنَاقَهُمْ وَيَضْرِبُوا أَعْنَاقَكُمْ؟» «ذِكْرُ اللَّهِ») .

واتە: ئای ئاگادارتان بکەمەوە لە باشترین کردەوەکانتان وە پاکترینیان لەلای پاشاکەتان (خوای گەورە) وە بەرزترینی لە پلەکانتان وە باشتر بۆتان لە بەخشینی ئاڵتون و زیو وە باشتر بۆتان لەوەی کە بگەن بە دوژمنەکەتان و بدەن لە گەردنیان و بدەن لە گەردنتان؟ بریتی یە لە زیکری خوای گەورە.

١٥- (إِيَّاكُمْ والظنَّ؛ فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ, وَلَا تَجَسَّسُوا, وَلَا تَحَسَّسُوا, وَلَا تَنَافَسُوا، وَلَا تَحَاسَدُوا, وَلَا تَبَاغَضُوا, وَلَا تَدَابَرُوا, وكُونُوا عِبَادَ اللهِ إخواناً) .

واتە: ئاگادارتان دەکەمەوە لە گومان بردنی خراپ، چونکە بەڕاستی گومانی خراپ بردن درۆترین قسەیە، وە سیخوڕی مەکەن و گوێ مەگرن لە قسەی نهێنی

خەڵکی، وە پێشبڕکێی یەکتر مەکەن لە دونیـادا، وە ئیرەیـی و حەسـودی بەیـەکتر مەبەن، وە ڕق و کینەتان لەیەکتر نەبێت، وە پشت لەیەکتر مەکـەن، وە هـەمووتان ببن بە بەندەی خواو برای یەکتری.

١٦- (تَبسُّـمُكَ فِي وَجْـهِ أَخِيـك صَـدَقَة، وأمْـرُكَ بِالْمَعْـرُوفِ صَـدَقَة، وَنَهْيُـكَ عَـنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ، وَإِرْشَادُكَ الرَّجُلَ فِي أَرْضِ الضَّلَالِ لَكَ صَدَقَةٌ، وَإِمَاطَتُكَ الْحَجَرَ وَالشَّوْكَ وَالْعَظْمَ عَن الطَّرِيقِ لَكَ صَدَقَةٌ، وَإِفْرَاغُكَ مِنْ دَلْوِكَ فِي دَلْوِ أَخِيكَ لَكَ صَدَقَةٌ) .

واتە: زەردەخەنەت لەڕووی براکەت خێـرو صـەدەقەیە، وە فـەرمان کردنـت بـە چاکەو قەدەغە کردنت لە خراپە خێرو صەدەقەیە، وە ڕێنمـایی کردنـت بـۆ کەسـی نەشارەزا خێرو صـەدەقەیە بـۆت، وە لابردنـی بـەردو دڕك و ئێسـقان لەسـەر ڕێگـا خێـرو صـەدەقەیە بـۆت، وە لەسـەتڵ و دۆلکەکـەت بکەیتـە نـاو سـەتڵ و دۆلکـەی براکەتەوە خێرو صەدەقەیە بۆت.

١٧- (تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ وَعَبْدُ الدِّرْهَمِ وَعَبْدُ الْخَمِيصَةِ، إِنْ أُعْطِيَ رَضِيَ وَإِنْ لَمْ يُعْطَ سَخِطَ، تَعِسَ وَانْتَكَسَ وَإِذَا شِيكَ فَلَا انْتَقَشَ. طُوبَى لِعَبْدٍ آخِذٍ بِعِنَانِ فَرَسِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَشْعَثُ رَأْسُهُ، مُغْبَرَّةٌ قَدَمَاهُ، إِنْ كَانَ فِي الْحِرَاسَةِ كَانَ فِي الْحِرَاسَةِ، وَإِنْ كَانَ فِي السَّاقَةِ كَانَ فِي السَّاقَة، وَإِن اسْتَأْذَنَ لَمْ يُؤْذَنْ لَهُ وَإِنْ شَفَعَ لَمْ يُشَفَّع) .

واتە: تیابچێت و لەناو بچێت بەندەی دونیاو بەندەی درهەم و بەندەی پۆشاك، ئەگەر پێی ببەخشرێت ڕازی دەبێت وە ئەگەر پێی نەبەخشرێت توڕە دەبێت، تیاچێت و لەناو بچێت وە ئەگەر دڕکێك بچێت بە پێیدا ناتوانێت دەری بکات بە موکێش، بەختەوەری و بەهەشت بۆ ئەو کەسەی کە دەستی بەڕەشمەی ئەسپەکەیەوە گرتووە لەپێناو خوای گەورەدا سەری لوول و گڤ پێیەکانی تۆزاوی ئەگەر پاسەوانی هەبێت لە پاسەوانیدایە، ئەگەر لە کۆتایی سوپاکە پێویستیان بێت لە کۆتایی دەبێت، وە ئەگەر داوای ئیزن بکات ئیزنی نادرێت وە ئەگەر تکا بکات تکاکەی وەرناگیرێت.

١٨- (تَفْضُلُ صَلاةُ الجَميعِ صَلاةَ أحَدِكُمْ وَحْدَهُ بِخَمْسٍ وَعِشرينَ جُزءاً، وَتَجْتَمِعُ مَلائِكَةُ اللَّيلِ وَمَلائِكَةُ النَّهارِ في صَلاةِ الفَجْرِ) .

واتە: نوێژی بە کۆمەڵ فەزڵی زیاترە بەسەر نوێژی یەکێك لە ئێوە بە بیستو پێنج جار، وە فریشتەی شەو و فریشتەی ڕۆژ لە نوێژی بەیانیدا کۆدەبنەوە.

١٩- (مَثَلُ الصَّلَوَاتِ الخَمْسِ كَمَثَلِ نَهْرٍ جَارٍ عَذْبٍ عَلَى بَابِ أَحَدِكُمْ يَغْتَسِلُ فِيهِ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسَ مَرَّاتٍ فَمَا يُبْقِي ذلِكَ مِنْ الدَّنَسِ) .

واتە: نمونەی پێنج نوێژەکە وەکو نمونەی دەریایەکی لەبەر ڕۆیشتوو وایە لەبەر دەرگای یەکێك لە ئێوە کە هەموو ڕۆژێك پێنج جار خۆی لێ بشوات چی چڵك و پیسیەکی پێوە دەهێڵێت.

٢٠- (مَثَلُ الْعَالِمِ الَّذِي يُعَلِّمُ النَّاسَ الْخَيْرَ وَيَنْسَى نَفْسَهُ كَمَثَلِ السِّرَاجِ يُضِيءُ لِلنَّاسِ وَيَحْرِقُ نَفْسَهُ) .

واتە: نمونەی ئەو زانایەی کە خەڵکی فێری چاکە دەکات و خۆی لەیاد دەکات وەکو چرایەك وایە دەوروبەرەکەی (خەڵکی) ڕوناك دەکاتەوەو خۆی دەسوتێنێت.

٢١- (مَثَلُ الذي يَتَعَلَّمُ العِلْمَ ثمَّ لا يُحَدِّثُ بِهِ؛ كَمَثَلِ الذي يَكْنِزُ الكَنْزَ فَلا يُنْفِقُ مِنْهُ) .

واتە: نمونەی ئەو کەسەی کە فێرە زانستی شەرعی دەبێت پاشان بۆ خەڵکی باس نەکات وەکو کەسێك وایە ماڵ و سامان کۆبکاتەوەو هیچی لێ نەبەخشێت.

٢٢- (مُعَقِّبَاتٌ لَا يَخِيبُ قَائِلُهُنَّ: ثَلَاثٌ وَثَلَاثُونَ تَسْبِيحَةً، وثَلَاثٌ وَثَلَاثُونَ تَحْمِيدَةً، وَأَرْبَعٌ وَثَلَاثُونَ تَكْبِيرَةً فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاةٍ مَكْتُوبَةٍ) .

واتە: چەند زیکرێك هەیە هەرکەسێك لەدوای نوێژە فەرزەکان بیڵێت پەشیمان و زەرەرمەند نابێت: سی وسێ سبحان الله و سی وسێ الحمد لله و سی وچوار الله اكبر لە پاش هەموو نوێژە فەرزەکان.

٢٣- (مَنِ اسْتَغْفَرَ لِلمُؤْمِنينَ وَلِلمُؤْمِناتِ كَتَبَ اللهُ لَهُ بِكُلِّ مُؤمِنٍ وَمُؤْمِنَةٍ حَسَنَةً) .

واتە: هەرکەسێك داوای لێخۆشبوون بۆ پیاوان و ئافرەتانی باوەڕدار بکات ئەوا خوای گەورە بە هەموو باوەڕدارێکی پیاو ئافرەت چاکەی بۆ دەنوسرێت.

٢٤- (مَنْ اضْطَجَعَ مَضْجَعًا لَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ فِيهِ إِلَّا كَانَ عَلَيْهِ تِرَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ قَعَدَ مَقْعَدًا لَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ فِيهِ إِلَّا كَانَ عَلَيْهِ تِرَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ. تِرَةٌ: حَسْرَةٌ).

واتە: هەرکەسێك لە شوێنێکدا ڕابکشێت و زیکرو یادی خوای گەورە نەکات ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێتە پەشیمانی و کەمی لەسەری، وە هەرکەسێك لە شوێنێکدا دانیشێت و زیکری خوای گەورە نەکات ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێتە پەشیمانی و کەمی لەسەری.

٢٥- (مَنْ أُعْطِيَ شَيئاً فَوَجَدَ فَلْيَجْزِ بِهِ، وَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيُثْنِ بِهِ، فَإنْ أَثْنى بِهِ فَقَدْ شَكَرَهُ، وَإنْ كَتَمَهَ فَقَدَ كَفَرَهُ، وَمَنْ تَحَلَّى بِمَا لَمْ يُعْطَ فَإِنَّهُ كَلابِسِ ثَوبَي زُورٍ ) .

واتە: هەرکەسێك شتێکی پێ درا توانای هەبوو با پاداشتی بداتەوە، وە ئەگەر توانای نەبوو با سوپاسی بکات چونکە ئەگەر مەدحی کرد ئەوا سوپاسی کردووە، وە ئەگەر بیشارێتەوە ئەوا کوفری نیعمەتی کردووە، وە هەرکەسێك خۆی بڕازێنێتەوە بە شتێك کە پێی نەدرا بێتو تێیدا نەبێت وەکو ئەوە وایە کە دوو پۆشاکی ناحەقی لەبەر کرد بێت.

٢٦- (مَنِ اقْتَنَى كَلْبًا لَيْسَ بِكَلْبِ صَيْدٍ وَلاَ مَاشِيَةٍ وَلاَ أَرْضٍ فَإِنَّهُ يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِهِ قِيرَاطَانِ كُلَّ يَوْمٍ) .

واتە: هەرکەسێك سەگێکی هەبێت و ڕایبگرێت نەسەگی ڕاو بێت نەسەگی ناو مەڕ بێت نە سەگی زەوی بێت ئەوا هەموو ڕۆژێك دوو قیرات (دوو شاخی گەورە) لە پاداشتی ئەو کەسە کەم دەکات.

٢٧- (مَنْ بَاتَ عَلَى ظَهْرِ بيتٍ لَيْسَ عَلَيْهِ حِجَابٌ، فَقَدْ بَرِئَتْ مِنْهُ الذِّمَّةُ) .

واتە: هەرکەسێك لەسەربانی ماڵ بخەوێت کە ستارەو پەرژینی نەبێت ئەوا لە ژێر پارێزگاری و چاودێری خوای گەورە دەرچووە.

٢٨- (مَنْ تَرَكَ ثَلاثَ جُمُعاتٍ مِنْ غَيرِ عُذْرٍ كُتِبَ مِنَ الْمُنافِقِينَ) .

واتە: هەرکەسێك سێ هەینی واز لە نوێژ بهێنێت لە مزگەوت بەبێ عوزرو بیانوی شەرعی ئەوا ناونوس دەکرێت لە دووڕووەکان.

٢٩- (مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، فُتِحَتْ لَهُ ثَمَانِيَةُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ) .

واتە: هەرکەسێك دەست نوێژ بشوات بەچاکی و پاشان بڵێت: شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە بەحەق شایەنی پەرستن بێت جگە لە زاتی پیرۆزی الله تاك و تەنهایەو هاوبەشی نیە، وە محمد ﷺ بەندەو نێردراوی خوایە، خوایە بمگێڕیت لە

تۆبەکاران و بمگێڕیت لە پاککراوان، ئەوا هەر هەشت دەرگای بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە بە ویستی خۆی لەکام دەرگاوە دەچێتە ژوورەوە بابچێتە ژوورەوە.

٣٠- (مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْكَهْفِ، عُصِمَ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ) .

واتە: هەرکەسێك دە ئایەت لەسەرەتای سورەتی کەهف لەبەر بکات ئەوا پارێزراو دەبێت لە فیتنەی دەجال.

٣١- (مَنْ رَأَى مُبْتَلًى فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي عَافَانِي مِمَّا ابْتَلَاكَ بِهِ وَفَضَّلَنِي عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقَ تَفْضِيلًا، لَمْ يُصِبْهُ ذَلِكَ الْبَلَاءُ) .

واتە: هەرکەسێك تووش بوویەك بەدەردو بەڵایەك ببینێت بڵێت: حەمدو سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە پاراستومی لەو بەڵایەی کە توشی کردویت وە فەزڵی داوم بەسەر زۆرێك لە دروست کراوەکانی، ئەوا ئەو دەردو بەڵایە توشی نابێت.

٣٢- (مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ) .

واتە: هەرکەسێك مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت و باوەڕی بە واجب بوونی هەبێت و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە خوای گەورە ئەوا خوای گەورە لەتاوانەکانی پێشووی خۆش دەبێت.

٣٣- (مَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا قَامَ نِصْفَ اللَّيْلِ، وَمَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا صَلَّى اللَّيْلَ كُلَّهُ ) .

واتە: هەرکەسێك نوێژی عیشا بە جەماعەت بکات وەکو ئەوە وایە نیوەی شـەو شەونوێژی کردبێت، وە هەرکەسێك نوێژی بەیانی بە جەماعـەت بکـات وەکـو ئـەوە وایە کە هەموو شەو شەونوێژی کردبێت.

٣٤- (مَنْ عَادَ مَرِيضاً أَوْ زَارَ أخاً لَهُ فِي الله، نَادَاهُ مُنَادٍ: أنْ طِبْتَ، وَطَابَ مَمْشَاكَ، وَتَبَوَّأتَ مِنَ الجَنَّةِ مَنْزِلاً) .

واتە: هەرکەسێك سەردانی نەخۆشێك بکات یان سەردانی برایەکی بکات بۆ خوا بانگکەرێك بانگی دەکات: بەخێر بچیت و ڕۆیشتننت بەخێر بێت و ماڵێك لەبەهەشـت جێگیر بکەیت بۆ خۆت.

٣٥- (مَنْ قَالَ إِذَا خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ: بِسْمِ اللَّهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، يُقَالُ لَهُ كُفِيتَ وَوُقِيتَ وَتَنَحَّى عَنْهُ الشَّيْطَانُ).

واتە: هەرکەسێك لەماڵ دەربچێت بڵێت: تەنها بەناوی خـواوە پشـتم تـەنها بـە خوا بەست وە هیچ تواناو هێزێك نیە تەنها بە خوا نەبێت، پێی دەوترێـت: بەسـتەو پارێزراوی لەشەیتانو شەیتان لێی دوور دەکەوێتەوە.

٣٦- (مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ) .

واتە: هەرکەسێك لەمانگی ڕەمەزان تەراویح بکات و باوەڕی بەوە هەبێت کە سوننەتەو چاوەڕوانی پاداشتی خوا بێت ئەوا خوای گەورە لەتاوانی پێشووی خۆش دەبێت.

٣٧- (مَنْ قَرَأَ آيَةَ الْكُرْسِيِّ دُبُرَ كُلِّ صَلاةٍ؛ لَمْ يَمْنَعْهُ مِنْ دُخُولِ الْجَنَّةِ إِلا أَنْ يَمُوْتَ).

واتە: هەرکەسێك لە پاش هەموو نوێژێکی فەرز ئایەتول کورسی بخوێنێت ئەوا هیچ شتێك ڕێگری ناکات لەچونە بەهەشتی تەنها مردن نەبێت.

٣٨- (مَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ ) .

واتە: هەرکەسێك شەوی قەدر ئاوەدان بکاتەوە بە خواپەرستی باوەڕی بەوە هەبێت کە سوننەتە و چاوەڕوانی پاداشتی خوای گەورە بکات ئەوا خوای گەورە لە تاوانی پێشووی خۆش دەبێت.

٣٩- (مَنْ كَانَ مَعَهُ فَضْلُ ظَهْرٌ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لَا ظَهْرَ لَهُ، وَمَنْ كَانَ لَهُ فَضْلُ زَادٍ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لَا زَادَ لَهُ) .

واتە: هەرکەسێك ئاژەڵی سواری زیادی هەیە بابیدات بەوەی کە نیەتی، وە هەرکەسێك خواردنی زیادی هەیە با بیدات بەوەی کە نیەتی.

٤٠- (مَنْ كَتَمَ غَيْظاً وَهُوَ قَادِرٌ عَلى أنْ يُنْفِذَهُ، دَعَاهُ اللهُ على رُءوسِ الخَلائِقِ حَتَّى يُخَيِّرَهُ مِنَ الحُورِ العِينِ يُزَوِّجُهُ مِنْهَا مَا شَاءَ) .

واتە: هەرکەسێك رقێك بخواتەوە کە توانای هەبێت دەری بڕێت ئەوا خوای گەورە لە پێش چاوی هەموو دروستکراوەکان بانگی دەکات تا سەرپشکی دەکات بە ویستی خۆی حۆری هەڵبژێرێت.

٤١- (مَنْ نَزَلَ مَنْزِلًا فَقَالَ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ حَتَّى يَرْتَحِلَ مِنْ مَنْزِلِهِ) .

واتە: هەرکەسێك لە شوێنێك لابدات و بڵێت: پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خوای گەورە (قورئانی پیرۆز) لەشەڕو خراپەی ئەوەی کە دروستی کردووە، ئەوا هیچ شتێك زیانی پێ ناگەیەنێت تا لەو شوێنە دەڕوات.

٤٢- (مَنْ نَسِيَ صَلَاةً أَوْ نَامَ عَنْهَا فَكَفَّارَتُهُ أَنْ يُصَلِّيَهَا إِذَا ذَكَرَهَا) .

واتە: هەرکەسێك نوێژێکی لەبیر چوو یان خەوی لێ کەوت لەسەری ئەوا کەفارەتەکەی ئەوەیە هەرکاتێك هاتەوە بیری نوێژەکەی بکات.

٤٣- (مَنْ نَصَرَ أخاهُ بِظَهْرِ الغَيبِ نَصَرَهُ اللهُ في الدُّنْيا وَالآخِرَةِ) .

واتە: هەرکەسێك بە نهێنی برایەکی سەر بخات ئەوا خوای گەورە لە دونیاو قیامەتدا سەری دەخات.

٤٤- (الْمُؤْمِنُ الَّذِي يُخَالِطُ النَّاسَ وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ أفْضَلُ مِنَ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لاَ يُخَالِطُ النَّاسَ، وَلاَ يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ) .

واتە: ئەو باوەڕدارەی تێکەڵاوی خەڵکی دەکات و ئارام دەگرێت لەسەر ئازاریان باشترە لەو باوەڕدارەی کە تێکەڵاوی خەڵکی نابێت و ئارام ناگرێت لەسەر ئازاریان.

٤٥- (الْمُؤْمِنُونَ هَيِّنُونَ كَالْجَمَلِ الْأَنِفِ، إِنْ قِيدَ انْقَادَ، وَإِذا أُنِيخَ عَلَى صَخْرَةٍ اسْتَنَاخَ) واتە: باوەڕداران ئاسان و سانان وەکو وشتری ملکەچ و زەلیل ئەگەر ملکەچی بکەیت و بەڕێوەی بەریت ئەوا ملکەچ دەبێت و بەڕێوە دەچێت، وە ئەگەر لەسەر بەردو تاوێر یخی بدەیتو داینیشێنیت ئەوا دادەنیشێت و بەقسەت دەکات.

٤٦- (مَنْ لَا يَشْكُرِ الْقَلِيلَ لَا يَشْكُرِ الْكَثِيرَ، التَّحَدُّثُ بِنِعْمَةِ اللَّهِ شُكْرٌ، وَتَرْكُهَا كُفْرٌ، وَمَنْ لَا يَشْكُرِ النَّاسَ لَا يَشْكُرِ اللَّهَ، وَالْجَمَاعَةُ بَرَكَةٌ، وَالْفُرْقَةُ عَذَابٌ ) .

واتە: ئەوەی سوپاسی کەم نەکات سوپاسی زۆریش ناکات، باس کردنی بەخششەکانی خوا سوپاس کردنە، وە باس نەکردنی کوفری نیعمەتە، وە ئەوەی سوپاسی خەڵکی نەکات سوپاسی خوای گەورەی نەکردووە، وە کۆمەڵی موسڵمانان بەرەکەتە وە پارچە پارچەییش سزایە.

٤٧- (ثَلاَثٌ أُقْسِمُ عَلَيْهِنَّ: مَا نَقَّصَ مَالٌ قَطٌّ مِنْ صَدَقَةٍ فَتَصَدَّقُوا، وَلا عَفَا لِرَجُلٍ عَنْ مَظْلَمَةٍ ظُلِمَهَا إِلاَّ زَادَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ بِهَا عِزًّا، فَاعْفُوا يَزِدْكُمُ اللهُ عِزًّا، وَلا فَتَحَ رَجُلٌ عَلَى نَفْسِهِ بَابَ مَسْأَلَةٍ يَسْأَلُ النَّاسَ إِلاَّ فَتَحَ اللَّهُ عَلَيهِ بَابَ فَقْرٍ) .

واتە: سێ شت هەن سوێندیان لەسەر دەخۆم هیچ ماڵێك هەرگیز بە خێرو صەدەقە کەم ناکات بۆیە خێرو صەدەقە بکەن، وە هیچ پیاوێك نیە کە ستەمی لێ کرابێت خۆش بێت لێی و لێی ببورێت ئیلا خوای گەورە زیاتر بە عیزەتی دەکات بۆیە لێبوردە بن خوای گەورە عیزەتتان زیاد دەکات، وە هیچ کەسێك نیە دەرگای سواڵکردن لە خۆی بکاتەوە کە داوا لە خەڵکی بکات ئیلا خوای گەورە دەرگای هەژاری لێ دەکاتەوە.

٤٨- (ثَلاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلاوَةَ الإِيمانِ، أَنْ يَكُونَ اللهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمّا سِواهُما، وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لا يُحِبُّهُ إِلاّ للهِ، وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ بَعْدَ أنْ أنْقَذَهُ اللهُ مِنْهُ كَما يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ).

واتە: سێ ڕەوشت هەیە هەرکەسێك تێیدا بێت ئەوا هەست بەتام و چێژو شیرینی باوەڕ دەکات: خواو پێغەمبەری ﷺ لە هەموو کەسێك لەلا خۆشەویستتر بێت، وە هەرکەسێکی خۆش ویست تەنها لەبەر خوا خۆشی بوێت، وە ئەوەندە پێی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ کوفر پاش ئەوەی کە خوای گەورە ڕزگاری کردووە لێی هەروەکو چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە ناو ئاگرەوە.

٤٩- ( ثَلاَثَةٌ فِي ضَمَانِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ، رَجُلٌ خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ إِلَى مَسْجِدٍ مِنْ مَسَاجِدِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَرَجُلٌ خَرَجَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللهِ تَعَالَى، وَرَجُلٌ خَرَجَ حَاجًّا).

واتە: سێ کەس هەن مسۆگەر لە پاراستنی خوای گەورەدان: پیاوێك دەربچێت بۆ مزگەوتێك لە مزگەوتەکانی خوای گەورە، وە پیاوێك دەربچێت بۆ غەزا کردن لە پێناو خوای گەورەدا، وە پیاوێك دەربچێت بۆ حەج کردن.

٥٠- (الْخَازِنُ الْمُسْلِمُ الْأَمِينُ الَّذِي يُعْطِي مَا أُمِرَ بِهِ كَامِلًا مُوَفَّرًا طَيِّبَةً بِهِ نَفْسُهُ فَيَدْفَعُهُ إِلَى الَّذِي أَمر لَهُ بِهِ أحَدُ المُتَصَدِّقِينَ ) .

واتە: خەزنەداری موسڵمانی دەست پاك کە چەندێك فەرمانی پێ بکردێت لە بیت المال ی موسڵمانان بەتەواوی دەیبەخشێت و لە دڵی دەردەچێت و دەیدات بەو کەسەی کە فەرمانی پێ کراوە ئەویش بە ئەندازەی خێرەکە خێری بۆ دەنوسرێت بەبێ ئەوەی لە خێری خێرکەرەکە کەم بکاتەوە.

٥١- (رَمَضانُ شَهْرٌ مُبارَكٌ، فِيهِ تُفْتَحُ أبوابُ الجَنَّةِ، وَتُغْلَقُ فِيهِ أبوابُ السَّعِيرِ، وَتُصَفَّدُ فِيهِ الشَّياطِينُ، وَيُنادِي مُنادٍ كُلَّ لَيلَةٍ: يَا بَاغِيَ الخَيرِ هَلُمَّ، وَيَا بَاغِيَ الشَّرِّ أقْصِرْ)

واتە: ڕەمەزان مانگێکی پیرۆزە دەرگاکانی بەهەشتی تێدا دەکرێتەوە، وە دەرگاکانی دۆزەخی تیا دادەخرێت، وە شەیتانەکان تێیدا دەبەسرێنەوەو کۆتو زنجیر دەکرێن، وە هەموو شەوێك بانگکەرێك بانگ دەکات و دەڵێت: ئەی خێرویستو خێرخواز وەرە پێشەوە، ئەی شەڕخوازو شەرەنگێز دەست هەڵگرەو بەسە.

٥٢- (الرَّجُلُ أحَقُّ بِصَدْرِ دَابَّتِهِ، وَأحَقُّ بِمَجْلِسِهِ إذا رَجَعَ) .

واتە: پیاو شایەنترە بە پێشەوەی ئاژەڵەکەی کە سوار بێت وە شایەنترە بە شوێنی دانیشتنەکەی ئەگەر گەڕایەوە.

٥٣- (قَالَ اللهُ تَعَالَى: كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إِلاَّ الصِّيَامَ، فَإِنَّهُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، وَالصَّوْمُ جُنَّةٌ فَإِذَا كَانَ يَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ فَلاَ يَرْفُثْ، وَلاَ يَصْخَبْ، فَإِنْ سَابَّهُ أَحَدٌ أَوْ قَاتَلَهُ فَلْيَقُلْ: إِنِّي امْرُؤٌ صَائِمٌ. وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ، وَلِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ يَفْرَحُ بِهِمَا: إِذَا أَفْطَرَ فَرِحَ بِفِطْرِهِ، وَإِذَا لَقِيَ رَبَّهُ فَرِحَ بِصَوْمِهِ).

واتە: خوای گەورە دەفەرمێت: هەموو کردەوەیەکی ئادەمیزاد بۆ خۆیەتی تەنها ڕۆژوو نەبێت ڕۆژوو بۆ منە من خۆم پاداشتی دەدەمەوە، وە ڕۆژوو قەڵغانە، وە ئەگەر ڕۆژێك بەڕۆژوو بوون با قسەی پڕوپوچ و نەزانی و نەفامی نەکەن، وە ئەگەر کەسێك جوێنی پێدان یان شەڕی لەگەڵ کردن با بڵێن: من کەسێکی بەڕۆژووم، وە سوێن بەو خوایەی گیانی محمدی بەدەستە بۆنی ناخۆشی دەمی ڕۆژووەوان لای خوای گەورە لە بۆنی میسك خۆشترە، وە ڕۆژووەوان دوو دڵخۆشی بۆ هەیە: کە ڕۆژووی شکاند دڵخۆشە بەڕۆژوو شکاندنەکەی، وە کە بگات بە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا دڵخۆشە بەڕۆژووەکەی.

٥٤- (قُلْ: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) وَالْمُعَوِّذَتَيْنِ حِينَ تُصْبِحُ وَحِينَ تُمْسِي ثَلَاثَ مَرَّاتٍ تَكْفِيكَ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ) .

واتە: لەبەیانیان و ئێواران سێ جار قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ و قُلْ أعُوذُ بِرَبِّ الفَلَقِ و قُلْ أعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ بخوێنە بەستە لە هەموو شتێك.

٥٥- (كلُّكُمْ راعٍ وكلُّكُمْ مسؤولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فَالْإِمَامُ رَاعٍ وَهُوَ مسؤولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِهِ وَهُوَ مسؤولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ عَلَى بَيْتِ زَوْجِهَا وَهِي مسؤولةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا، وَالخَادِمُ رَاعٍ فِي مَالِ سَيِّدِهِ وَهُوَ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، والرَّجُلُ رَاعٍ فِي مَالِ أبِيهِ وَهُوَ مسؤولٌ عَن رَعِيَّتِهِ، فَكُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْؤُولٌ عَن رَعِيَّتِهِ) .

واتە: هەمووتان شوان و بەرپرسن وە هەمووتان بەرپرسن لەژێر دەستەکانتان، ئیمام و پێشەوا شوان و بەرپرسە لەژێر دەستەکانی، وە پیاو لەماڵی خۆی شوانەو بەرپرسە و لێپرسراوە لە ژێر دەستەکانی، وە ئافرەت لەماڵی پیاوەکەی شوانەو بەرپرسە وە لێپرسراوە لەژێر دەستەکانی، وە خزمەتکار شوانەو بەپرسە لەماڵی گەورەکەی وە بەرپرسە لەژێر دەستەکانی، وە پیاو شوانەو بەرپرسە لە ماڵی باوکی وە لێپرسراوە لە ژێر دەستەکانی، هەمووتان شوان و بەرپرسن و هەمووتان لێپرسراون لەژێر دەستەکانتان.

٥٦- (اتَّقِ الْمَحَارِمَ تَكُنْ أَعْبَدَ النَّاسِ، وَارْضَ بِمَا قَسَمَ اللَّهُ لَكَ تَكُنْ أَغْنَى النَّاسِ، وَأَحْسِنْ إِلَى جَارِكَ تَكُنْ مُؤْمِنًا، وَأَحِبَّ لِلنَّاسِ مَا تُحِبُّ لِنَفْسِكَ تَكُنْ مُسْلِمًا، وَلَا تُكْثِرِ الضَّحِكَ، فَإِنَّ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تُمِيتُ الْقَلْبَ) .

واتە: خۆت لە حەرام بپارێزە دەبیتە خواپەرستترین کەس، وە ڕازی بە بەو بەشەی کە خوای گەورە دابەشی کردووە بۆت دەبیت بەدەوڵەمەندترین کەس، وە چاکە لەگەڵ دراوسێکەت بکە دەبیتە باوەڕەدار، وە ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە بۆ خەڵکیش پێت خۆش بێت دەبیتە موسڵمان، وە زۆر پێ مەکەنە چونکە بەڕاستی زۆر پێکەنین دڵ دەمرێنێت.

٥٧- (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَصْبَحَ وإِذَا أمسى قال: «أَصْبَحْنَا عَلَى فِطْرَةِ الْإِسْلَامِ، وَكَلِمَةِ الْإِخْلَاصِ، وَعَلَى دِينِ نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَعَلَى مِلَّةِ أَبِينَا إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا مُسْلِماً وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ) .

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بەیانی و ئێوارەی بکردایەتەوە دەیفەرموو: بەیانیمان کردەوە لەسەر فیترەتی پاکی ئیسلام وە لەسەر وشەی ئیخلاص و دڵسۆزی لا الە الا اللە یە وە لەسەر دینی پێغەمبەرمان محمد ﷺ وە لەسەر نەتەوەی ئیبراهیمی باوکمان کە لەشیرك لایدابوو بۆ یەکخواپەرستی بە موسڵمانێتی وە ئەو هەرگیز لە هاوبەش بڕیاردەران نەبووە.

٥٨- وَكـانَ إذا أفْطَـرَ عِنْـدَ قَـومٍ قَـالَ: (أَفْطَـرَ عِنْـدُكُمُ الصَّـائِمُونَ، وأَكَـلَ طَعَـامَكُمُ الأَبْرَارُ، وصَلَّتْ عَلَيْكُمُ المَلائِكَةُ) .

واتە: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر لەلای کەسانێك ڕۆژووی بشکاندایە دەیفەرموو: خوایە هەر ڕۆژووەوان لەلاتان ڕۆژوو بشکێنێت، وە هەر چاکەکاران خواردنتان بخوات، وە فریشتە دوعای خێرتان بۆ بکات.

٥٩- (مَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْـنَهُمْ إِلَّا نَزَلَـتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَـةُ، وَحَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَـةُ، وَذَكَـرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ) .

واتە: هیچ کۆمەڵە کەسێك نیە لە ماڵێك لە ماڵەکانی خـوای گـەورەدا کۆببنـەوە کە قورئانی پیرۆز بخوێنن و لێکۆڵینەوەو تەفسیرو مانای بکـەن لـە نێـوان خۆیانـدا ئیلا هێمنـی و ئـارامی و ئاسـوودەیی دادەبەزێتـە سـەریان وە ڕەحمـەت و بـەزەیی خـوای گـەورە دایاندەپۆشـێت وە فریشـتەکان دەوریـان دەدەن وە خـوای گـەورە لەلای فریشتەکانی بە باشە باسیان دەکات.

٦٠- (مَا تَحَابَّ اثْنَانِ فِي اللَّهِ إِلَّا كَانَ أَفْضَلُهُمَا أشدُّهما حُبًّا لِصَاحِبِهِ) .

واتە: هیچ دوو کەسێك نیە لەبەر خوا یـەکتریان خـۆش بوێـت ئـیلا باشـترینیان ئەوەیانە کە زیاتر هاوڕێکەی خۆشتر بوێت.

٦١- (مَا جَلَسَ قَوْمٌ مَجْلِسًا لَمْ يَذْكُرُوا اللَّهَ فِيهِ، وَلَمْ يُصَلُّوا عَلَى نَبِيِّهِمْ إِلَّا كَانَ عَلَيْهِمْ تِرَةً، فَإِنْ شَاءَ عَذَّبَهُمْ، وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُمْ ) .

واته: هیچ کەسانێك نیە لە شوێنێكدا دانیشن و زیکری خوای گەورە نەکەن و سەڵاوات لەسەر پێغەمبەرەکەیان ﷺ نەدەن ئیلا دەبێتە هۆی پەشیمانی لەسەریان ئەگەر خوای گەورە ویستی لێ بێت سزایان دەدات وە ئەگەر ویستی لێ بێت لێیان خۆش دەبێت.

٦٢- (مَا سَأَلَ رَجُلٌ مُسْلِمٌ اللهَ الجَنَّةَ ثَلاثاً إِلَّا قَالَتِ الجَنَّةُ: اللَّهُمَّ أَدْخِلْهُ الجَنَّةَ، وَلا اسْتَجارَ رَجُلٌ مُسْلِمٌ اللهَ مِنَ النَّارِ ثَلاثاً إِلَّا قَالَتِ النَّارُ: اللَّهُمَّ أَجِرْهُ مِنِّي) .

واته: هیچ موسڵمانێك نیە سێ جار داوای بەهەشت لە خوای گەورە بکات ئیلا بەهەشت دەڵێت: خوایە بیخەرە بەهەشتەوە، وە هیچ موسڵمانێك نیە سێ جار پەنا بگرێت بە خوای گەورە لە ئاگری دۆزەخ ئیلا ئاگری دۆزەخ دەڵێت: خوایە بیپارێزە لە من.

٦٣- (مَا مِنْ قَوْمٍ يَقُومُونَ مِنْ مَجْلِسٍ لَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ تَعَالَى فِيهِ إِلَّا قَامُوا عَنْ مِثْلِ جِيفَةِ حِمَارٍ، وَكَانَ ذلِكَ المَجْلِسُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً يَومَ القِيامَةِ) .

واتە: هیچ کەسانێك نیە لە شوێنی دانیشتنیان هەڵسن و زیکرو یادی خوا نەکەن ئیلا هەڵدەستن وەکو ئەوە وایە لەسەر کەلاکی گوێدرێژ هەڵسابێتن، وە ئەو دانیشتنە لەڕۆژی قیامەتدا دەبێتە پەشیمانی لەسەریان.

٦٤- (مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا سَيُكَلِّمُهُ رَبُّهُ لَيس بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ تُرْجُمَانٌ؛ فَيَنْظُرُ أَيْمَنَ مِنْهُ، فَلَا يَرَى إِلَّا مَا قَدَّمَ، وَيَنْظُرُ أشْأمَ مِنْهُ فَلَا يَرَى إِلَّا مَا قَدَّمَ، وَيَنْظُرُ بَيْنَ يَدَيْهِ فَلَا يَرَى إِلَّا النَّارَ تِلْقَاءَ وَجْهِهِ، فَاتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ، وَلَو بِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ) .

واتە: هیچ کەسێك لە ئێوە نیە ئیلا خوای گەورە قسەی لەگەڵدا دەکات بەبێ ئەوەی کە وەرگێڕ لە نێوانیاندا هەبێت تەماشای لای ڕاستی دەکات هیچ شتێك نابینێت تەنها کردەوەکانی نەبێت، وە تەماشای لای چەپی دەکات هیچ شتێك نابینێت تەنها کردەوەکانی نەبێت، وە تەماشای پێش خۆی دەکات هیچ شتێك نابینێت تەنها ئاگری دۆزەخ نەبێت ڕووبەڕوویەتی، بۆیە خۆتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن ئەگەر بە لەتە خورمایەکیش بێت کە بیکەنە خێر وە ئەگەر بە قسەیەکی باشیش بێت.

٦٥- (إِنَّ فِي الْجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ أَعَدَّهَا اللَّهُ لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ مَا بَيْنَ الدَّرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ ) .

واتە: بەڕاستی لەبەهەشتدا سەد پلە هەیە خوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ ئەو کەسانەی کە جیهاد دەکەن لە پێناویدا نێوان هەر دوو پلەیەك بە ئەندازەی نێوان ئاسمان و زەوی یە.

وَالحَمْدُ للهِ الذِي بِنِعْمَتِهِ تَتِمُّ الصَّالِحَاتُ

سوپاس بۆ خوای گەورە تەواو بووم لەوەرگێڕانی ئەم پەرتووکە بەسودە لەشەوی شەممە ١٨ موحەڕڕەمی ١٤٣٥ك بەرامبەر ٢٠١٣/١١/٢٣ز .

دوای ئەوەی لە ڕۆژی شەممە دەستم کرد بە وەرگێڕانی بەرواری ٣ شەووالی ١٤٣٤ك بەرامبەر ٢٠١٣/٨/١٠ز .